# ئەو چیرۆکانەی فێری ژیانیان کردم

موحسین جەببار
و. ناری محمد شێروانی

کتێبێکە زیاتر لە جارێک دەیخوێنیتەوە

چەند کورتە چیرۆکێکی ناوازەی هەموو سەردەم و وڵاتێک
پڕە لە حیکمەت و سوود و خۆشی و پەند
بۆ مامۆستایان و ڕاهێنەران - بۆ دایکان و باوکان
بۆ هەموو لاوێکی کوڕ یا کچ - بۆ هەموو قوتابخانە و ماڵێک

**جوانترین دیاری بۆ گشت بۆنەکان**

ناوی کتێب: ئەو چیرۆکانەی ژیانیان فێر کردم

ناوی نووسەر: موحسین جەبار

وەرگێڕانی: ئاری محمد شێروانی

دیزاینی ناوەوە: احمد خالد

دیزاینی بەرگ: رەمەزان عبداللە

چاپی: یەکەم

سەرپەرشتی چاپ: ئەهرۆ محمود

پێوانەی لاپەڕە: ١٤ × ٢٠ سم

دیزاین: دار المناهج

ژمارەی سپاردن: (      )ی ساڵی ٢٠١٣ لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکانی دراوەتێ.

# ئەو چیرۆکانەی ژیانیان فێر کردم

نوسینی

موحسین جەبار

وەرگێرانی لە عەرەبیەوە بۆ کوردی

ئاری محمد شێروانی

سـالی ﴿ ٢٠١٣ ﴾

# پێشکەشبە

- بەوانەی کە چیرۆکیان لەم چیرۆکە ناوازانە نووسیوەتەوە تا وەك چرایەکی رووناك کەرموە بۆ نەوەکانی داهاتوو بمێنێتەوە.....
- بە خانەی بلاّو کردنەوە و هەموو ئەو کەسانەی کە بەشدار بوون لە ئامادە کردن و لەچاپدان و دابەشکردنی ئەم کتێبە......
- بە خانەوادە خۆشەویستەکەم،و هاورێ ئازیزەکانم لە سەرتاسەری وولاّت، بە گشت مامۆستا بەرێزەکانم...

سوپاسی هەمووتان دەکەم، و ئەم بەرهەمەتان بە دیاری پێشکەش دەکەم، سازندنیشم لەلایەن خواوەیە

موحسین جەبار

# پێشەکی

خۆێنەرانی ئازیزم، ئەوی هانی دام بۆ نووسینی ئەم کتێبە پێویستی زۆری ئێمە بوو بۆ کۆکردنەوەی ئەم چیرۆکە کورتە پڕمانا بەخش و قەشەنگ و جوانانە لە یەك کتێبدا چونکە هەرەکێکیانمان بە پەرش و بڵاوی لە ئامیلکەیەك یان لەکتێبێکدا خوێندوەتەوە و ئەمەش زەحمەتی زۆرمان بۆ دروست دەکات لە کاتی گەڕانەوە بۆیان یان پارێزگاریکردنیان.

بۆیە هەڵسام بە کۆکردنەوەی جوانترین و خۆشترین چیرۆك لە هەموو وولاتەکان و سەردەمەکان، هەر چیرۆکێك وانەیەکە بۆ بۆنەیەك لە بۆنە تایبەت و گشتیەکان، بۆ خولەکانی راهێنان و فێرکردن، دانایش ئەو شتەیە کە باوەڕدار بەشوێنیدا دەگەڕێت.

فێر کردن بە چیرۆك شێوازێکی کاریگەرە لەسەر دەروون و ناخی بیسەر و خوێنەران گەورە بن یان بچووك، چیرۆك گرنگیەکی زۆری هەیە لە راکێشانی سەرنجی کەسەکان و هەستەکانیان و یەکێکە لە ئامرازە سەرکەوتوەکان بۆ نمایشکردنی مادەی زانستی بە شێوازێکی ئاسان و روون، بۆیە قورئانی پیرۆز گرنگی زۆری داوە بە نمایشکردنی چیرۆك چونکە خۆشی بۆ دەروون هەیە و وورەکان بەهێز دەکات و پەند و ئامۆژگاری لێوەردەگیرێت.

ئەمە بەشی یەکەمی کتێبەکەمانە و پەنا بەخوا هەوڵدەدەین بەشی تریشی لێ چاپ بکەین بۆ ئەوەی وەك مۆم رێگای بەردەم نەوەکانی داهاتوو رووناك بکاتەوە لەهەموو شوێن و سەردەمێکدا.

لە بەشێکی ئەم کتێبەدا، گرنگی فێرکردن بە چیرۆك، و چۆنیەتی نووسینی چیرۆکم بۆتان نووسیوە تاوەکو ئێوەش بتوانن چیرۆکە گرنگەکانتان بنووسن و وێنەیەکمان بۆ رەوانە بکەن تاوەکو لە بەشەکانی داهاتوودا پشت بە خوا بۆتانی بڵاو بکەینەوە.

مرحسین جەبار

# چۆن سوود لەم کتێبە وەردەگریت

❶ دەبێت ئارەزوویەکی بەهێزت هەبێت بۆ فێر بوون.

❷ هەر چیرۆکێك دووجاری بخوێنەوە بەر لەوەی بچیتە سەر چیرۆکیکی تر.

❸ هەر چیرۆکێکت خوێندەوە لای هاوەڵان و قوتابیان و منداڵان باسی بکە.

❹ لەکۆتایە هەر چیرۆکێکدا تۆزێك بوەستە و بیر لەماناکانی بکەوە و چۆن بتوانین پەندەکانی لە ژیانمان ئەنجام بدەین.

❺ دەست بکە بە پەیڕەو کردنی ئەزموونە بە سوودەکانی خاوەن چیرۆکەکان لە ژیانی رۆژانەتدا تا ببێتە بەشێك لە نەریتت.

❻ تێنوسێکی بچووك دیاری بکە بۆ نووسینەوەی ئەو دەستکەوتانەی کە بەهۆی پەیڕەو کردنی ئەم ئەزموون و چیرۆکە بەسوودانە بەدەستت هێناوە.

❼ چیرۆکە راستەقینە و سەرکەوتوەکانی خۆتمان بۆ بنووسەوە کە لە ژیانی کرداری خۆت روویان داوە و بۆمانی رەوانە بکە تا خوێنەران سوودی لێوەرگرن.

❽ ئەگەر سوودت لەم کتێبە بینی ئەوا لەلای کەسانی تر باسی بکە یان بە دیاری پێشکەشیانی بکە تا بیخوێننەوە و پەیامەکە بگات بە هەموو کەسێك.

# فێرکردن بە چیرۆک

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿نَحْنُ نَقُصُّ عَلَيْكَ أَحْسَنَ الْقَصَصِ بِمَا أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ هَذَا الْقُرْآنَ وَإِن كُنتَ مِن قَبْلِهِ لَمِنَ الْغَافِلِينَ﴾ (یوسف: ٣)

چیرۆک توانایەکی بەهێزی هەیە لە راکێشانی سەرنجەکان، و کۆکردنەوەی هەستەکانی چیرۆك نووس، سرووشتی چیرۆك وایکردووە خۆشەویست بێت بۆ ناخی مرۆڤ چونکە هەواڵی پێشینان و و رووداوەکان و شتە ناوازەکانی تێدا کۆ دەبێتەوە، سەرەڕای ئەمانە هەموو لە هزرا دەمێنێتەوەو زۆر بە کەمی فەرامۆش دەکرێت. لەبەر ئەوەیە قورئانی پیرۆز گرنگی تایبەتی داوە بە چیرۆك چونکە پەند و عیبرەت و دانایی و سەرگوزەشتە ی تێدا کۆدەبێتەوە سەرەڕای ئەوەی ئاسوودەییش بە ناخی مرۆڤ دەبەخشێت.

قورئانی پیرۆز کاتێك کە چیرۆکێك دەگێڕێتەوە مەبەستی پێی تەنها گێڕانەوەی رووداوەکە نیە بەڵکو وەرگرتنی دانایی و پەندو عیبرەت و مەسەلەکانی یەکتاپەرستیە کە لە نێو دێڕ و لاپەڕەکانیدا تێبینی دەکرێت هەروەها بەیانکردنی حیکمەت و یاسا جێگیر و نەگۆڕەکانی خودا لە نێو مرۆڤەکاندا، هەر لە نێو ئەمانەشدا روونکردنەوە دەربارەی ئەحکامی فیقهیش لە نێو هەندێکیان بەدی دەکرێت.

لەبەر ئەم رۆڵە گەورەی چیرۆك لە بواری فێرکردن و پەروەردە کردنی مرۆڤەکان، دیقەت بگرە چۆن پێغەمبەری خوا درووود و صەلات و سەلامی خوای لەسەر بێت شێوازی چیرۆکی بەکار دەهێنێت بۆ پەروەردە کردن و خۆڕاگری و فێرکردنیان

ئەمەش بە زەقی لە نموونەی چیرۆکی خەبابی کوڕی ئەرەت لە سەرەتای بانگەوازی ئیسلامیدا دەردەکەوێت کاتێك دەیاننالاند لە ژێر زەبر و زەنگ و ئازار و ئەشکەنجەی قورەیشیەکان لە مەککەدا، **خەبباب دەڵێت:** ڕۆژێکیان چوینە لای پێغەمبەری خوا (صلات و سەلامی خوای لەسەر بێت) لە ژێر سێبەری کەعبەدا دانیشتبو و عەباکەی بەخۆی دا دابوو و سکالاَمان لای ئەو کرد و گوتمان: ئەی پێغەمبەری خوا بۆ داوای کۆمەکی و پشتیوانیمان بۆ ناکەی، بۆ نزامان بۆ ناکەی تاوەکو خوای گەورە لەم ئەهامەتی و ناخۆشیە رزگارمان بکات؟ ئەویش لە وەلاَمدا گوتی:

﴿پیاوانی پێش ئێوە دەهێنا و دەیانخستە نێو چاڵێکەوە، پاشان مشارێکیان دەهێنا و لەسەر سەریان دائەناو دەیانکرد بە دوولەتەوە و گۆشت و ئێسقانیان لەیەکتر جیا دەکردەوە و ئەم هەمرو کارە پاشگەزی نەدەکردەوە لە ئایینەکەی، سوێند بە خوا ئەم ئایینە سەر دەکەوێت و وای لێدێت سوار ئەسپ (شوان) بە مێگەلە مەڕەوە لە سەنعاوە دێت بەرەو حەزرەمەوت لەهیچ شتێك ناترسێت جگە لەخوا و وپاشان گورگ، بەلاَم ئێوە پەلە دەکەن﴾.

ئەم ڕووداوەی کە پێغەمبەری خوا بۆ خەببابی باس کرد کە لە داهاتوودا ڕوودەدات، گەر تێڕامان بۆ بکەی، پەند و عیبرەتی زۆر گەورەی لێوەردەگیرێت، بۆ نموونە: پێغەمبەری خوا ئاشکرا دەکات کە ئازار و ئەشکەنجەدان یەکێکە لە یاساکانی خوا کە دووچاری یەکتاپەرستان دەبێتەوە، هەروەها باس لە خۆڕاگری پێشینان دەکات بەرامبەر بە ئازار و ئەشکەنجە و پاشگەز نەبوونەوەیان لە بیرو باوەڕەکەیان ئەگەر نرخەکەی ژیانیشیان بووبێت، لەلایەکی تر ئەم فەرموودەیە لایەنێکی غەیبی و داهاتووی ئەم ئایینەی ئاشکرا کردوە کە دوارۆژ بۆ ئەم ئایینەیە و سەردەکەوێت و

باڵادەست دەبێت، ئینجا لە کۆتایی فەرموودەکەیدا گەورەیی ئارامگرتن روون دەکاتەوە و زەمی پەلەکردن دەکات کاتێك دەفەرموێت: (بەڵام ئێوە پەلە دەکەن).

## کارتێکردن و باوەڕ پێهێنان لە ڕێی چیرۆکەوە

ئەگەر پەروەرشیار یت یان سەرکردە و هەوڵی ئەوەت دەدا کار لە کەسانی تر بکەیت و هەوڵی ئەوە دەدەیت باوەڕیان پێبێنیت، بێگومان هەوڵ دەدەیت لە ڕێی چیرۆك گێڕانەوە یان هێنانەوەی نموونە بێت، ژیان بریتیە لە زنجیرەیەك چیرۆك و سیناریۆی دوا بە دوای یەکتر. چیرۆکەکانی خۆت بە بە لێهاتوویی و ئاسانی بگێڕەوە تێبینی دەکەیت چۆن کەسەکان تێکەڵی چیرۆکەکەت دەبن و لەگەڵیا دەژین و وەك تۆ فێری ئەم پەندەکانی ناو چیرۆکەکە دەبن، بەمەش ئاسەواری قووڵ لە ناخیاندا جێدەهێڵێت و ناسڕێتەوە. ئەگەر پەروەرشیار بوویت ئەوا دەبێت بزانیت چۆن لێزانی چیرۆك خوانی بەکار بێنیت بۆ کردنەوەی ئەندێشەی بەرامبەرەکانت و کاریان تێ بکەیت، و لە دوایدا باوەڕیان پێبهێنیت.

## کاتێك كە چیرۆك دەگێڕیەوە لەبیرت بێت كە :

- **چیرۆك بە ئاسانی هەڵوێستی دەروونی كەسانی تر دەگۆڕێت:**

تۆ دەتوانیت لە رێی چیرۆكەوە لەگەڵ ئەو هەرزەكارە شكست خواردو و لاسارو بێ باكانە بكەیت تا كاریان بكەی و هەڵوێستە نێگەتیڤەكانیان بگۆڕیت بە پۆزەتیڤانە.

- **گوێ لە چیرۆكی ئەوانی تر بگرە:**

پێویستە فێری توانای بیستنی چیرۆكی ئەوانی تر ببیت شان بەشانی گێڕانەوەی چیرۆك بۆیان، ئەمەش بەمەبەستی تێگەیشتنە لە رەهەندە دەروونیەكانیان تا دواتر بتوانی بەنێو ناخیاندا بچیت.

- **یەكەمجار چیرۆك پاشان رێنموونی:**

دواهەمین شت كە خەڵك لەتۆی چاوەڕوانە، گوێگرتنە لە برێكی زۆرتر لە رێنمایی ووشك و فەرمانی راستەوخۆ كە بەشێوەی (بیكە یان مەیكە) دەیبیستن. بەڵام سەرەڕای ئەمانە هەموو دەكرێت ئەمە مافی خۆت بێت وەك پەروەرشیار، بەڵام دەبێت دان بەوەش بنێیت كە هەرزەكاران نوقمی فەرمان و نەهی كردن بوونە و توانای بری تریان نەماوە.

- **چیرۆك... ئەو بەهایانەن كە باوەڕم پێیەتی:**

گومانی تێدانیە كە باشترین رێگە بۆ فێركردنی هەر بەهایەكی ئەخلاقی و كرداری بریتیە لە پێشەنگی باش. بەڵام دووەم باشترین رێگا بۆ هەمان مەبەست گێڕانەوەی چیرۆكانەیە كە گوزارشت لە گرنگی ئەم بەهایانە دەكات.

كاتێك كە دەڵێیت ئێمە رێزلە ئەمانەت و دەست پاكی دەگرین لەگەڵ دەوروبەرمان ئەوا ئەم قسەیە هیچ مانایەك نابەخشێت چونكە تەنها بریتیە لە چەند ووشەیەك یان

دروشمێکی بریقەدار. بەڵام کاتێك کە چیرۆکێك دەربارەی فرۆشیارێك دەگێڕیەوە کە هەڵەی بەرامبەر کڕیارێك کرد بەڵام دواتر هەستی بە هەڵەکەی خۆی کردو چوە لای کڕیارەکە و داوای لێبووردنی لێکرد و ئەم هەڵوێستەی فرۆشیارە وای لە کڕیارەکە کرد کە لەجاران زیاتر شتی لێبکڕێت و متمانەی زیاتری پێبکات تۆ ئەلێرەدا پەیامێکی روونت ئاراستەی گوێگرانت کردوە کە ئەمانەت مانای چی دەگەیەنێت و مەبەستت چی بوە لە رێز گرتن لە ئەمانەت.

کاتێك کە بە فەرمانبەرەکانت دەڵێیت پێویستە کارکردن لەسەر بنەمای راشکاوی و هاوکاریکردنی یەکتر بێت، بۆی هەیە ئەم قسانەت لای ئەوان زۆر روون نەبێت و نەزانن مەبەستت لە (راشکاوی و هاوکاریکردن) چی بێت. تۆ ووشەت پێدان، بەڵام مانا یاخود نموونە یاخود چیرۆکێکت بۆ روونکردنەوەی ووشەکانت پێنەدان تا لەمەبەستی ئەم ووشانەت تێبگەن، کەچی کاتێك چیرۆکی یەکێك لەو فەرمانبەرە کەمتەرخەمانەیان بۆ دەگێڕیەوە کە چۆن بە ئەنقەست هەڵەکانی خۆی دەشاردەوە و دەیخستە ئەستۆی هاوڕیکانی و چۆن ئەو کارەی بوە هۆی ئەوەی کە ئەو کۆمپانیا یەی کە کاری لێدەکات زیانی زۆر گەورەی لێکەوت و دواتر بوە هۆی دەرکردنی لە کارەکەی، ئەوا بەم رێگەیە دڵنیا دەبیت کە پەیامەکەت پێیان گەیشتوە.شتێك لە بیرەوەریدا دەمێنێتەوە:

**ئەوەی لە هەموو شتێك زیاتر لە بیرەوەریتدا دەمێنێتەوە چیرۆکە.**

## فێرکردن و پەروەردە کردنی منداڵ لە ڕێی چیرۆکەوە

چیرۆك یەکێکە لە ڕەوشتە جوانە خۆشەویستەکانی لای گەورە و بچووك، چەندە چیرۆکەکە بیرۆکە و شێوازی جوان و قەناعەت هێن بێت ئەوا سەرنج ڕاکێشتر و شەوقدار تر دەبێت.

سەبارەت بە منداڵان چیرۆك ئامرازێکی پەروەردەیی و فێرکاری گرنگە و کاریگەری زۆر گەورەیە لەسەریان، ئەوان بە ئارەزووی خۆیان زۆر سەرسوڕهێنەرانە گوێی بۆ دەگرن بە پێچەوانەی ئامرازەکانی تر. سەیری گەلانی تر بکە بە جیاوازی گەشە کردن و کەلتوور و پێشکەوتنیان چۆن لە زووەوە دەرکی ئەم مەسەلەیان کردوە و لە پێناو زامنکردنی بەردەوامبوونی ئەو عورف و یاسایانەی کە ژیانیان ڕێکدەخات و زامنی ڕیز بێت لەلایەن هەموو لایەك ئەوا لە شێوەی چەند چیرۆکێکی میللی کە بەساڵاچوان بەبێ ماندوو بوون و ناراستەوخۆ هەموو ئەو کلتوور و ڕەوشتانەی کە هەیە بە ئاسانی بیگەیەنن بە منداڵەکان. هەر لەبەر ئەوەیە جیاوازی هەیە لە نێوان ڕەفتار پەیوەندیەکانی منداڵانی شار و لادێ بە دەوروبەریان (بەراوردێك لە نێوان منداڵانی شار کە تەلەفزیۆن بە ئەرکی پەروەردەیان هەڵدەستێت بکە لەگەڵ منداڵانی دێهاتەکان کە تا ئێستا باوانیان تا شێوازی چیرۆك گێڕانەوە بەکار دێنن).

چیرۆك کاریگەریەکی زۆری هەیە لەسەر لایەنە جیاوازەکانی کەسایەتی منداڵ بە تایبەت چیرۆکی بیستراو، چونکە کار ئاسانی بۆ کەسی پەروەرشیاری دەکات و چەند ئامانجێك دەپێکێت بەبێ ماندوو بوون لەمانەش:

- ❖ دەوڵەمەند کردنی منداڵ لە ڕووی زمان پاراوی.
- ❖ چێژ وەرگرتنی منداڵ لە گێڕانەوەی چیرۆك و بەهێز کردنی ئەندێشەی.

❖ راستکردنەوەی ڕەفتارەکانی منداڵ لەڕێی چەسپاندنی هەندێك ڕەفتار و لابردنی هەندێکی تر بەبێ ئەوەی پێویست بکات فشار بخەیە سەری تا چەند ڕەوشتێك فێربێت. کەچی چیرۆك لەڕێی ڕووداوەکانی ناوی دەتوانرێت هەموو ئەو حیکمەتانەی کە پێویستە بگات بە منداڵ واقیعیانە و بە شێوازێکی قەناعەتکارانە بەرجەستە بکرێت و بەدواداچوون بۆ وورده کاریەکانی بکەیت.

## رەگەزە گرنگەکانی نووسینی چیرۆك

١. **بۆهاتن (ئیلهام)**: هەوڵبدە بیرۆکە و کەش و هەواو ڕووداوەکانی ناو چیرۆکەکەت لە ئەندێشەت وەربگری، زۆر گرنگە بیرۆکەی چیرۆکەکەت باش و بەپێز بێت بۆ سەرکەوتنی. واچاکە لە هەموو شوێنێکدا پێنووسێك و دەفتەرێکی بچووکت لابێت تاوەکو ئەو بیرۆکانەی بە هزرت داداێن تۆماریان بکەیت. کتێبی جۆراو جۆر بخوێنەوە بۆ ئەوەی زەخیرەیەکی باش لە بیرۆکە کۆبکەیەوە چونکە سوودت پێدەگەیەنێت.

٢. **سەرەتا**: دەتوانیت چەند بیرۆکەیەك دیاری بکەیت، ئەمانە چیرۆکەکەت پێکدەهێنن، بەمەش نەخشەیەکی ڕوون وێنا دەکەیت بۆ ئەوەی کە گەرەکتە نووسین دەربارەی بکەیت. دەتوانیت دەست بە نووسین بکەیت و ئەوەی تر بۆ پێنووسەکەت جێبهێڵە پەرە بە ڕووداوەکان بدات بە پێی کەسایەتیەکانی ناو ڕووداوەکان.

٣. **پاڵەوان یان پاڵەوانەکان**: پاڵەوانەکانی ئەم چیرۆکە کێن؟ ئەو کەسایەتیانە کێن کە هەڵیان دەبژێریت؟ بە ووردی ناسنامەی هەریەکەیان دیاری بکە ناوەکانیان بنووسە و وێنا و خوو وهزری هەر کەسایەتیەك بکێشە تا لەنزیکەوە بیناسیت. ناوی ئەو کەسایەتیانە بۆ کەسایەتیەکانی ناو چیرۆکەکەت هەڵبژێرە کە لەلات خۆشەویستن

وەك ناوی هاوڕێ و ناسیاوی خۆشەویست و نزیك لە خۆت بەهەمان شێوە بۆ دیاریکردنی ناوی شوێنەکان، دەشتوانی ناوی خوازراویش بەکاربێنیت بۆ نا؟

٤. **ڕووبەڕووی ماندووبوون بەوە:** ئەگەر هەستت کرد تۆ بەندی بیرۆکەیەکی دیاریکراوی و ناتوانیت لێی دەربچیت، یاخود هەستت کرد بیرۆکەت پێنەماوە و هیچت بۆ نایەت، لەو کاتەدا پێویستە تۆزێك پشوو بەخۆت بدەیت و دوورکەویەوە لە پێنووس و پەڕەکانت، بڕۆ بۆ دەرەوە بۆ هەڵمژینی هەندێك هەوای پاك، پەیوەندی بە هاوڕێیەکتەوە بکە دوای ئەمە دەبینیت چۆن بیرۆکەی نوێی زۆر جوانت دێتە ئەندێشەوە.

٥. **خوێندنەوە:** دوای تەواو بوون لە نووسینی چیرۆکەکە چەند ڕۆژێك وازی لێبێنە پاشان دووبارە بیخوێنەوە، دڵنیابە کە تێبینی چەند هەڵەیەکی ڕێنووسی و ڕێزمانی دەکەیت، ئینجا چەند زیادەیەکی بنەڕەتی و لاوەکی دەخەیە نێو چیرۆکەکەت چونکە تۆ ئێستاکە بە چاوی ڕەخنەگرانە سەیری چیرۆکەکەت دەکەیت.....لە کۆتاییدا هەست بە ڕەزامەندی دەکەیت بەرامبەر چیرۆکەکەت.

## چەند بیرۆکەیەکی بەسوود بۆ فێرکردنی چۆنیەتی نووسینی چیرۆك و ڕۆمان

ئەگەر گەرەکت بوو چیرۆکێکی ئارەزوومەند بنووسیت و خەڵك عەودالی بن و ڕووی تێبکەن و چێژ لە خوێندنەوەی وەربگرن ئەوا ئەم خاڵانەی خوارەوە بگرە بەر:

١- بابەتێکی جوان و هەڵبژێرە کە مەبەستەکەی ڕوون بێت.

٢- بە سادەیی بینووسە و بەهێمنی، پەلە مەکە لە نووسینەوە.

٣- گرنگی بدە بەو شێوازەی نووین بدە کە ڕۆمانەکەتی پێدەنووسیت و هەوڵبدە درێژی نەکەیەوە بە تایبەت گەر مانای نوێ نەبەخشێت.

٤- هەوڵدە ماوەی نێوان دێڕەکان کەمێك دوور بێت تا چاوی وەرگر یاخود خوێنەر ماندوو نەکات و ببێتە هۆی ئەوەی دوور کەوێتەوە لە ڕۆمانەکەت.

٥- شتێکی جوانە ئەگەر وێنە یاخود نیشانەت بۆ زیاد کرد.

٦- مەرج نیە چیرۆکەکەت درێژ بێت، (٣٠)دێڕ یان (٥٠) دێڕ بێت تا ببێتە چیرۆکێکی تەواو، دەکرێت کورتە چیرۆك بێت و لە(٥) یان (٦)دێڕ پێکهاتبێت و بەشێوەیەکی زۆر جوان داڕێژرابێت و مانایەکی جوان و تەواو بدات.

٧- گرنگی دانت بە مان لەسەر حیسابی شێوازی نووسینەکەت نەبێت بە شێوەیەك کە شێوازی نووسینەکەت ببێت بە شێوازی هەواڵدان نەك شێوازی نووسینی چیرۆکێکی جوان. ئەڵبەت تۆ ئازادیت لە هەڵبژاردنی ئەو دەربڕینانەی کە لەگەڵت دەگونجێن، زمانی عەرەبی پڕە لە ووشەی هاومانا و دەربڕینی جوان.

٨- بەهرەی خۆت بەکەم مەزانە و بە بچووکی سەیر مەکە. هەریەك لە ئێمە بەهرەیەکی هەیە، ئەگەر حەزت بە خوێندنەوەی چیرۆك هەبوو دەتوانیت دوای خوێندنەوە و تێکۆشان و ڕێکخستنی، بینووسیەوە.

٩- نووسینی هەر نووسەرێکی بەناوبانگ بخوێنەوە کە تۆ خۆشت دەوێت.

١٠- گرنگ نیە چیرۆکەکە ڕاستەقینە بێت، بەڵکو جوانی لەوەدایە ئەندێشەت ڕۆمانێکی جوان دابڕێژێت وەك هەموو نووسەر و ئەدیبەکان.

# دانووستان

فێری لێهاتوویی بە لە دانووستان و  بەستنی خرید

باوك بۆ کوڕەکەی: دەمەوێت هاوسەرگیری لەگەڵ ئەو کچە بکەی کە بۆتم هەڵبژاردوە.

کوڕەکەی: بەڵام من خۆم هاوسەری خۆم هەڵدەبژێرم باوکە

باوك: بەڵام من کچی بیل گێتس م بۆت هەڵبژاردوە.

کوڕ: باشە، لەم حاڵەتەدا............رازیم

باوکی کوڕە  چوە لای  بیل گەیتس  پێی گوت: زاوایەکم بۆ کچەکەت هەیە.

بیل: ئاخر هێشتا  کچەکەم بچووکە بۆ مەسەلەی هاوسەرگیری

باوك: بەڵام زاوا جێگری سەرۆکی بانکی نێو دەوڵەتیە

بیلێ گەیتس: ئاااااا! لەم حاڵەتەدا......رازیم

ئەم جارەیان باوکی کوڕە چوو بۆ لای  بەڕێوەبەری بانکی نێو دەوڵەتی و پێی گوت: گەنجێکم هەیە دەشێ بۆ پلەی جێگری سەرۆکی بانك.

بەڕێوەبەر: بەڵام ئێمە جێگری زۆرمان هەیە، شوێنی بەتاڵمان نیە.

باوکی کوڕە: کەسی پێشنیار کراو زاوای بیل گێتسە.

بەڕێوەبەر: لەو حاڵەتە.......ئەوا دامەزرا.........

# گەشبین بە

وائیل بەڕێوەبەری چێشتخانەیەکە، بەردەوام رووگەشە، هەرکاتێك هەرکەسێك لە هەواڵی بپرسێت وەڵامی ئەو: (من زۆر باشم) ە

کاتێك ئەو چێشتخانەیەکی نوێی کڕی زۆرێك لەو فەرمانبەرانەی لای ئەو کاریان دەکرد، لەگەڵی مانەوە و بەردەوام بوون لە کار کردن لەگەڵی.

دەزانن بۆچی لەگەڵی بەردەوام بوون؟

چونکە وائیل بەردەوام هانی دەروبەری خۆی دەدا و گڕووتینی پێدەبەخشین.

هەر کارمەندێك ئەگەر ئەو رۆژەی حاڵی باش نەبوایا ئەوا وائیل لەلای بوو بۆ یارمەتیدانی و فێری دەکرد چۆن پۆزەتیڤانە سەیری بابەتەکە بکات. بینینی ئەم هەڵس و کەوتانە لەم پیاوە، وای لێکردم بیر بکەمەوە و.....لێی بپرسم:

من تێناگەم.....چۆن دەتوانیت ئەم هەموو کاتە ئاوا گەشبین بیت؟

وائیل وەڵامی دایەوە و گوتی: هەموو بەیانیەك کاتێك کە لە خەو هەڵدەستم تەنها دوو ئەگەرم لەپێشە، یەکەمیان گەشبین و رووخۆش بە، ئەوی تریشیان روو گرژ و رەش بین! من بەردەوام رووخۆشی و گەشبینی هەڵدەبژێرم.

هەر کاتێکیش کە شتێکی خراپ روو دەدات، دوو ئەگەرم لە پێشە یان دەبێت ببم بە قوربانی یاخود دەبێت وانەیەك لەم مەسەلەیە فێر ببم، ئەڵبەت بەردەوام ئەوەم هەڵبژاردوە کە پێویستە وانە لەم مەسەلەیە وەرگرم. هەر کاتێك کەسێك هاتە لام و کێشەیەکی هەبوو ئەوا من دوو ئەگەرم لە پێشە، یا ئەوەتا تەنها گوێ لە کێشەکەی بگرم، یان دەبێت لایەنە پۆزەتیڤانەکەی ئەم کێشەیەی بۆ روون بکەمەوە،

ئەلبەتە بەردەوام ئەوە هەڵدەبژێرم کە لایەنە پۆزەتیڤانەکەی مەسەلەکەی بۆ روون بکەمەوە.

پێم گوت: بەلاَم ئەمە کارێکی ئاسان نی یە.

وەلاَمی دامەوە و گوتی: بەپێچەوانەوە، بەڵکو زۆر ئاسانە... ژیان هەمووی بریتیە لە ئەگەر و هەڵبژاردن.

ئەگەر ئەو دۆخانەی کە تێی دەکەوی کورتی بکەیەوە، دەبینیت کە هەمووی بریتیە لە چەند هەڵبژاردنێك، بەپێی دۆخەکە تۆ پەرچە کردارەکەت هەڵدەبژێریت، هەرخۆشت شێواز و چۆنیەتی کاریگەریت بەسەر خەڵکەوە هەڵدەبژێریت، بەهەمان شێوەش هەر خۆت ئەوە هەڵدەبژێریت ئاخۆ روو خۆش بیت یان روو گرژ، لەکۆتاییشدا هەڵبژاردنی خۆتە چۆن ژیان بەسەر دەبەیت.

بەڵێ من ئەوە لە وائیل فێر بووم، هەموو رۆژێك دوو ئەگەرت لەپێشە، یان چێژ لە ژیانت وەرگرە یان رقت لێی بێتەوە، تا کە شت کە مولکی راستەقینەی خۆتە و کەس ناتوانێت لێتی زەوت بکات یاخود کۆنترۆڵی بکات دیدگای تۆیە بۆ ژیان.

**ئەگەر توانیت گرنگی بەمە بدەیت ئەوا هەموو شتێك لە ژیانتدا ئاسانتر دەبێت.**

# چیرۆکی کچێکی شۆخ

دەگێڕنەوە کوڕێك بە باوکی دەڵێت: دەمەوێت زەماوەند لەگەڵ کچێك بکەم چاوەکانی زۆر جوان و دڵ رفێنن.

باوکەکە بە شادیەوە: ئەو کچە لە کوێیە بۆتی بخوازم؟

کە چوون بۆ ماڵەکە و باوکەکە چاوی بە کچەکە کەوت سەرسام بوو پێی.....

بە کوڕەکەی گوت: گوێ بگرە کوڕەکەم،ئەم کچە لە ئاستی تۆ دا نیە و تۆ بەکەڵکی ئەو نایەیت، ئەم کچە شایەنی پیاوێکی وەکو منی ئەزموونداره لە ژیان.....

کوڕە سەری سوڕما لە قسەکانی باوکی و گوتی: نەخێر من دەیخوازم نەك تۆ!

ئیتر بوو بە ناکۆکیان.........

چوون بۆ بنکەی پۆلیس بۆ چارەسەرکردنی کێشەکە. کاتێك چیرۆکەکەیان بۆ ئەفسەرەکە گێڕایەوە، فەرمانی پێکردن کچەکەی بۆ بێنن تا پرسیاری لێبکات، کامیان هەڵدەبژێرێت لە باوك و کوڕەکە.......

بەڵام کاتێك ئەفسەرەکە چاوی بە کچەکە کەوت.....شەیدای جوانیەکەی بوو و گوتی: ئەم کچە بەکەڵك ئێوە نایەت بەڵکو شیاوی کەسێکی پایە بەرزی وەك منە.

دووبارە بوو بە دەمەقاڵێیان......و هەرسێکیان چوون بۆ لای وەزیر.....

بەڵام هەرکە وەزیر چاوی بە کچەکە کەوت گوتی: ئەم کچە تەنها وەزیرێکی وەك من شیاوی خوازبێنی کردنیەتی.

جارێکی تر دەمەقاڵێ سەری هەڵدایەوە.......

لەم نێوەندەدا کچە هاتە دەنگ و گوتی: چارەسەر لای منە....من ئێستاکە ڕادەکەم ئێوەش ڕاکەن بەدوامەوە، یەکەم کەس لە ئێوە توانی من بگرێت ئەوا زەماوەندی لەگەڵدا دەکەم.

دەستیان کرد بەڕاکردن... لە ناکاو هەرسێکیان کەوتنە ناو چاڵێکی قووڵەوە، کچەکە هاتە سەر لێواری چاڵەکەو لە بەرزاییەوە سەیری کردن و گوتی:

زانیتان من کێم؟

من ئەو دونیایەم کە هەموو خەڵك خەریکە بەدوامدا ڕادەکات و لەبەر ڕاکردنیان بە شوێنی مندا، ئایینی خۆیان لەبیرکردوە تا دەکەونە ناو گۆڕ، هەرگیز منیش بەدەست ناهێنن.....

هێشتاکە هەر سوورن لەسەرم؟

هێشتاکە هەر سوورن لەسەرم؟

هێشتاکە هەر سوورن لەسەرم؟

# هۆکاری فەرامۆش کراو

چیرۆکی مامۆستای دکتۆر خالید ئەلجوبیر راوێژکاری نەشتەرگەری دڵ و خوێن بەرەکان.

دکتۆر دەڵێت:

ڕۆژێکیان کە سێشەممە بوو، نەشتەرگەریەکی دڵم کرد بۆ منداڵێکی تەمەن دوو ساڵ و نیو، ڕۆژی دواتر کە چوار شەممە بوو منداڵەکە تەندروستی باش بوو و چالاکانە سەیری دەور و بەری خۆی دەکرد. ڕۆژی پێنج شەممە کاتژێر ١١:١٥ ئەم خوریەیەم قەت لەیاد ناچێت کاتێك نەخۆشیارەکە هات و هەواڵی وەستانی دڵ و هەناسەی منداڵەکەی پێدام، منیش بەراکردن بەرەو منداڵەکە چووم و دەستم کرد بە شێلانی دڵی بۆ ماوەی ٤٥ خولەك، بەڵام سوودی نەبوو، دڵی ئەم منداڵە هەر بە وەستاوی مایەوە، لە ناکاو دڵەکەی بەکار کەوتەوە و ئێمەش سوپاسی خوامان کرد لەسەر بەکار کەوتنەوەی و جێمان هێشت و چووم بۆ لای خانەوادەکەی تاوەکو باسی حاڵەتەکەیان بۆ بکەم.

هیچ لەوە ناخۆش تر نیە کاتێك کە پزیشك ناچار دەبیت باس لە خراپی باری تەندروستی نەخۆشێك دەکات بۆ خانەوادەکەی هەرچەندە گرنگە ئەم شتە بزانن، بۆیە پرسیاری باوکی منداڵەکەم کرد گوتیان دایکی لێرەیە، منیش پێم گوت: هۆکاری وەستانی دڵی منداڵەکەت بەهۆی خوێن بەربوون بوو لە قوڕگی و ناشزانین هۆکارەکەی چی یە و پێشبینی دەکەم مێشکیشی مردبێت.

بەڕای ئێوە دەبێت ئەم دایکە چی بڵێت؟ ئایا هاواری کرد؟ کردی بە ناڵە و فوغان؟ گوتی خەتای تۆیە؟

نەخێر هیچ کامێك لەمانە نەبوو، تەنها گوتی: سوپاس بۆ خوا، و جێی هێشتم.

دوای ١٠ ڕۆژ منداڵەکە دەستی بە جوولە کرد و ئێمەش دڵمان خۆش بوو و سوپاسی خوامان کرد لەسەر ئەوەی کە مێشکی بەشێوەیەکی باش کار دەکات.

بەڵام دوای ١٢ ڕۆژ جارێکی تر دڵی ئەم منداڵە وەستایەوە بەهۆی هەمان حاڵەتی خوێن بەربوون، بۆیە دەست بەجێ بۆماوەی ٤٥ خولەك دڵی منداڵەکەمان شێلا....بەڵام ئەنجامی نەبوو. ناچار بووم بەدایکی بڵێم ئەمجارەیان هیچ هیوایەکمان نیە بۆ مانەوەی منداڵەکەت.

ئەویش ووتی: سوپاس بۆ خوا، خوایەگیان ئەگەر خێر لە چاکبوونەوەیدا هەیە ئەوا شیفای بۆ بنێرە.

جارێکی تر دڵی منداڵەکە کەوتەوە کار، بەڵام دوای ئەم جارە ٦ جاری تریش لە کار کەوت تا دواجار پسپۆڕێکی بواری هەناسە بە ویستی خوای گەورە توانی خوێن بەربوونەکە رابگرێت و دڵەکەی بەکار کەوتەوە. ٣ مانگ بەسەر ئەم منداڵەدا تێپەڕی بێ ئەوەی جووڵە بکات، تا ڕۆژێکیان هەواڵیان دا کە دەستی بە جووڵە کردوە، ئێمە زۆر دڵمان خۆش بوو بەم هەواڵە بەڵام خۆشیەکەمان زۆری نەخایاند چونکە کێم و جەراحەتێکی زۆر لەسەری دەهاتە دەر، باوەڕم پێبکەن لە ژیانمدا شتی وام نەبینیبوو بۆیە ناچار بووین بە دایکی بڵێین کە ئەمجارەیان ئەستەمە منداڵەکەت بژیت، ئەگەر لەوەستانی چەند جارەی دڵی رزگاری بوویێت، ئەوا لەم کێم و جەراحەتە قورتاری نابێت، ئەویش سوپاسی خوای گەورەی کرد. خێرا

منداڵەکەمان گواستەوە بۆ بەشی نەشتەرگەری مێشك و دەمار و ئەوانیش دەستیان کرد بە چارەسەرکردنی...
دوای ٣ هەفتە منداڵەکە بە ویستی خودا لەم نەخۆشیە تازەیەی چاك بوویەوە بەلام هیچ جوولەیەکی نەبوو، پاش دوو هەفتە دووچاری ژاراوی بونێکی سەیری خوێن بوو و پلەی گەرمی دەگەیشتە ٤١,٢ پلەی سەدی.
بە دایکەکەم گوت: مێشکی کوڕەکەت لە مەترسیەکی گەورە دایە، هیچ ئومێدێکمان نیە لە مانەوەی، ئەویش بە ئارامیەکی زۆر و متمانەیەکی تەواوەوە گوتی: خوایە گیان ئەگەر خێر لە چاکبوونەوەیدا هەیە ئەوا شیفای بۆ بنێرە.
ئەم منداڵە لەسەر قەرەوێڵەی ژمارە (٥) خەوتبوو دوای پشکنینی رۆژانە بۆی رووم لە قەرەوێڵەی ژمارە (٦) کرد، منداڵێکیان لەسەر خەواندبوو بەهۆی بەرز بوونەوەی پلەی گەرمی. دایکەکە ئۆقرەی نەمابوو بۆیە هاواری کرد دکتۆرگیان....دکتۆر گیان بە هانام وەرە تای کوڕەکەم زۆر بەرزە ٣٧،٥ خەریکە دەمرێت!
منیش بە سەرسوڕمانەوە پێم گوت:
بۆ سەیری دایکی ئەم منداڵە ناکەیت، تای کوڕەکەی ٤١ پلە زیاترە کەچی ئارامی گرتوە و شوکرانەی خوا دەکات؟! دایکەکە لەوەلامی قسەکانم گوتی: ئاخر ئەم ئافرەتە هۆشی لای خۆی نەماوە!. لەوکاتەدا ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەرم هاتەوە یاد صەلات و سەلامی خوای لەسەر بێت کە دەفەرموێت (شادی بۆ نەناسراوان) بەڕاستی نەیتوانی ئەم دایکە لەسەر حەقیقەتی خۆی بناسێت، بەڵێ پێغەمبەری خوا تەنها دوو وشەی گوت، بەلام ئومەتێك دەهەژێنێت، باوەڕم پێبکەن

بەدرێژایی ٢٣ ساڵی کارکردنم وەکو ئەم ئافرەتەم نەبینی بەم شێوەیە ئارام و خۆڕاگر بێت.

دوای ماوەیەك گورچیلەکانی ئەم منداڵە لەکار کەوت و بەدایکیمان ڕاگەیاند ئەچارەیان هیچ هیوا نەماوە و ئەستەمە ڕزگاری ببێت، ئەویش هەروەکو جاران بەهەمان ئارامی و خۆڕاگریەوە گوتی سوپاس بۆ خوا و جێی هێشتم.

لە دواهەمین هەفتەی مانگی چواردا منداڵەکە لە حاڵەتی ژاراوی بوونەکە ڕزگاری بوو، کەچی لە مانگی ٥ دا دووچاری حاڵەتێکی تری نامۆ بوو من لە ژیانی خۆمدا ئەخۆشی وام نەبینیوە! هەوکردنێکی زۆر توندی پەردەی ناوەوەی سینگ، هەموو ئێسقانەکانی سینگ و دەوروو بەری گرتەوە، ناچاری کردم سینگی شەق بکەم و دڵی بێنمە دەرەوەی لەشی بە شێوەیەك، کاتێك شتێکمان بۆی دەگۆڕی دڵەکەی لەبەر چاومان لێیدەدا و کاری دەکرد. کە گەیشتین بەم حاڵەتە ناخۆشەی منداڵەکە ڕووم لە دایکی کرد و گوتم: ئیتر تەواو ئەم حاڵەتە هەر چارەسەر نابێت، بارەکەی زۆر ناخۆشە. ئەویش گوتی: سوپاس بۆ خوا.

شەش مانگ و نیو ئەم منداڵە بەم شێوەیە مایەوە، لە هۆڵی چاودێری چڕ دەرمانهێنا بەڵام نە جوولەی هەیە نە قسە کردن، نە بیستن و نەپێکەنین سینگی بە لەتکراوی و دڵەکەشی لەبەر چاوتدا لەدەروەی لەشی کاری دەکرد....ئەم دایکەخۆڕاگرە بێ ئەندازە یارمەتیدەداین لە گۆڕینی ئەم پارچە و ئامێرە پزیشکیانەی کە بۆ منداڵەکەیان دانابوو.

دوای ئەم هەموو ناخۆشی و ئاڵۆزیە لە دۆخی ئەم منداڵە، ئایا چاوەڕوانی و پێشبینی چی دەکەن؟ ڕزگار بوونی منداڵێك ئەم هەموو مەترسی و نەخۆشی و ناخۆشیەی دیوە؟

پێشبینی چی دەکەن لە دایکێك کە هەموو چرکەیەك منداڵەکەی لەسەر لێواری مەرگ و گۆڕ دابێت....جگە لە پاڕانەوە و نزا کردن هیچ شتێکی تری لەدەست نەیەت؟ دەزانن دوای دوو مانگ و نیو ئەم منداڵە چی بەسەر هات؟

ئەم منداڵە بە تەواوی چاك بوویەوە، خودای گەورە بە بەزەیی خۆی و وەك پاداشتێك بۆ ئەم دایکە ئارام گر و خۆڕاگرە منداڵەکەی پێبەخشیەوە و منداڵەکە هەستاوە سەر قاچەکانی و غارغارێنی دەکرد و بەدەوری دایکی دەخولایەوە وەك بڵێی هەر نەخۆشیش نەبوویێت!.

چیرۆکەکە تەواو نەبوو....ئەوەی منی بە گریان هێنا هەر ئەوە نەبوو، بەڵکو ئەوەی کە لەدوای ئەمە روویاندا،

دوای ساڵ و نیوێك لە دەرچوونی ئەم منداڵە لە نەخۆشخانە، یەکێك لە و خۆشك و برا بەرێزانەی بەشی نەشتەرگەری هەواڵی پێدام کە پیاوێك و هاوسەرەکەی، دوو منداڵیان پێیەو دەیانەوێت چاویان پێت بکەوێت، منیش گوتم کێن ئەمانە؟ گوتی نایانناسم، منیش رۆیشتم بۆ بینینیان......

کە سەیرم کردن، ئەوانم ناسیەوە، بەڵێ ئەوانە دایك و باوکی ئەم منداڵەن کە پێشتر نەشتەرگەریم بۆ ئەنجام دابوو.

منداڵەکەیانم بینی تەمەنی بوو بوو بە ٥ ساڵان و وەك گوڵ گەش و جوان بوو، بۆخۆی دەخولایەوە و دایك و باوکەکەشی منداڵێکی تەمەن ٤ مانگانیان بەدەستەوە بوو، منیش پێشوازیم لێکردن و بە گاڵتەوە لە باوکەکەم پرسی: ئەمە منداڵی ژمارە ١٣ هەمینە یان ١٤؟

ئەو بەزەردەخەنەیەکی زۆر سەیرەوە سەیری کردم و گوتی: ئەمە کوڕی دووەمانە دکتۆر گیان. ئەو کوڕەمان کە جەنابتان نەشتەرگەریتان بۆ کرد منداڵی یەکەمان

بوو، دوای ١٧ ساڵ چاوەڕوانی خوای گەورە پێی بەخشین و ئەویش تووشی ئەم هەموو نەخۆشیە بوو کە جەنابتان دەیزانن.

نەمتوانی خۆم بگرم. کۆنتڕۆڵی خۆم لەدەستدا و دەستم کرد بە گریان و چاوەکانم پڕ بوون لە فرمێسك، بەبێ ویستی خۆم دەستی پیاوەکەم گرت و بردم بۆ ژوورێکی نزیك و لە خێزانەکەیم پرسی: ئەو هاوسەرەت کێیە ئاوا ئارام گر بوو لەسەر ئەو منداڵەی کە دوای ١٧ ساڵ لە ئەزۆکی بێتە دونیاو بەم شێوەیە؟

نابێت ئەم ژنە کەسێکی ئاسایی بێت، بەڵکو دڵی پڕە لە باوەڕ و متمانە بوون بە خوای بالآدەست.

گوێ لە هاوسەرەکەی بگرن خوشك و برایانم، بە تایبەت ئێوە خوشکانی ئازیزم........ مایەی سەرفرازیە کە لەسەردەمێکی وەکو ئەمڕۆمان ئافرەتی وا خۆڕاگر هەبێت و لە رەگەزی ئێوە بێت.

هاوسەرەکەی گوتی: ئێمە ١٩ ساڵە زەماوەندمان کردوە، تەنها یەك شەوی بێ شەو نوێژ بەڕێ نەکردووە مەگەر بە عوزری شەرعی نەبێت، یەکجاریش نەمبینیوە پاش ملە باسی کەس بکات یاخود درۆ بکات، لە کاتی دەرچوونم و گەڕانەوەم بۆ ماڵەوە بەردەوام بە نزاکردنەوە بەڕێی کردووم و پێشوازی لێکردووم و بەخێرهاتنەوەی لێکردووم، بە هەموو خۆشەویستیەك و سۆز و میهرەبانیەوە بەکارەکانی ناو ماڵی خۆی هەڵدەستێت.

قسەکانی تەواو کرد و گوتی: لەبەر ئەم هەموو رەوشت بەرزی و سۆز و میهرەبانیە گەورەی کە لەبەرامبەر مندا هەیەتی، شەرم دایگرتووم و ناتوانم سەیری چاوەکانی بکەم....!. منیش لە وەلآمدا گوتم:

کەسی وەك ئەم ئافرەتە، هەر شایانی ئەوەیە بەم جۆرە رێزی لێبگریت.

لێرەدا قسەکانی دکتۆر خالید جەبیر خوا بیپارێزێت تەواو بوو.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَلَنَبْلُوَنَّكُم بِشَيْءٍ مِّنَ ٱلْخَوْفِ وَٱلْجُوعِ وَنَقْصٍ مِّنَ ٱلْأَمْوَٰلِ وَٱلْأَنفُسِ وَٱلثَّمَرَٰتِ ۗ وَبَشِّرِ ٱلصَّـٰبِرِينَ ﴿١٥٥﴾ ٱلَّذِينَ إِذَآ أَصَـٰبَتْهُم مُّصِيبَةٌ قَالُوٓا۟ إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيْهِ رَٰجِعُونَ ﴿١٥٦﴾ أُو۟لَـٰٓئِكَ عَلَيْهِمْ صَلَوَٰتٌ مِّن رَّبِّهِمْ وَرَحْمَةٌ ۖ وَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُهْتَدُونَ ﴿١٥٧﴾ ﴾ (البقرة: ١٥٥-١٥٧)

واتە: (ئێمە تاقیتان دەکەینەوە بە هەندێك لە ترس و برسیەتی و کەمبوونی سامان و رۆح و بەرووبووم و مزگێنیش بدە بە خۆڕاگران. ئەوانەی کاتێك تووشی نەهامەتییێك و بەلآیەك بوون دەڵێن ئێمە بۆ خواین و هەر بۆلای ئەویش دەگەڕێینەوە.ئەوانە خودا بەرەکەت و میهرەبانی و سۆزی خۆی بەسەریاندا دەبارێنێت، ئەوانە رێنموونیکراون) پێغەمبەری خودا صلات و صەلات و سەلامی خوای لەسەر بێت دەفەرموێت: ((ما يصيب المسلم من نصبٍ ولا وَصَبٍ ولا هَمٍّ ولا أذىً ولا غَمٍّ حتى الشَّوكَةَ يُشاكُها إلاّ كَفَّرَ اللهُ بِها خَطاياه))

## نەعلەکەی پاشا

دەگێڕنەوە پاشایەك هەبوو حوکمڕانی وولاتێکی زۆر گەورە و فراوانی دەکرد......ڕۆژێکیان بڕیاری دا گەشتێکی ووشکانی دوور ئەنجام بدات. لە کاتی گەڕانەوەی سەیری کرد قاچەکانی ئاوساون بەهۆی ڕۆیشتنی لەو ڕێگا سەختانە، بۆیە فەرمانێکی شاهانەی دەرکرد گشت شەقامەکانی ناو شار و مەملەکەتەکەی بە پێست داپۆشرێت؟.

یەکێك لە راوێژکارانی پاشا پێشنیارێکی تری خستە بەردەم پاشا.....

ئەو بە پاشای گووت: خاوەن شکۆ پارچە پێستێك لە ژێر پێی جەنابتان دابنرێت، ئەمە گرفتەکانمان ئاسانتر بۆ چارەسەر دەکات.

باوەڕ دەکەن ئەمە سەرەتای دروست کردنی نەعلەی پێلاو بوو!

بۆیە،ئەگەر ویستت لە جیهاندا بە شادی بژیت........

هەوڵ مەدە هەموو جیهان بگۆڕیت، بەڵکو کار لەسەر ئەوە بکە خۆت بگۆڕیت....

پاشان هەوڵ بدە هەموو دونیا بگۆڕیت.....

# ریکلام و نابیناکە

پیاوێکی نابینا لەسەر سەکۆی بەردەم باڵەخانەیەك دانیشت و شەبقەکەی خستە نێو قاچەکانی و تابلۆیەکی لە تەنیشتی دانا کە لەسەری نووسرابوو (من نابینام تکایە یارمەتیم بدەن)

پیاوێکی ریکلام کردن بەلای نابینا کەدا تێپەڕی و پاشان تۆزێك وەستا و سەیرێکی شەبقەی نابیناکەی کرد، بینی چەند قڕووشێکی تێدایە، ئەویش هەندێکی تری بۆ دانا و بێ ئەوەی مۆڵەت لە کوێرەکە وەرگرێت تابلۆکەی لێبرد و نووسینێکی تری لەسەر کرد و دایناوە شوێنی خۆی و رۆیشت.

نابیناکە هەستی کرد کە شەبقەکەی پڕ بوە لەپارەی ئاسن و کاغەز، زانی گۆڕانکاریەك رووی داوە بەڵام لەبەر نەیزانی لە چیە.

دوای ماوەیەك بیستی کە لەسەر تابلۆکەی نووسراوە (ئێمە لە وەرزی بەهارین، بەڵام من ناتوانم جوانی بەهار ببینم)، ئینجا زانی کە گۆڕانکاریەکە لە تابلۆکەدا روویداوە.

حیکمەت:

شێوازەکانی کار و گفتووگۆت بگۆڕە کاتێك زانیت کارەکانت بە باشی بەڕێوەناچن

# چیرۆکی بازەکە

دەڵێن بازێك هەبوو لەسەر لووتکەی یەکێك لە چیاکان دەژیا و هێلانەکەشی لەسەر لووتکەی دارێك دروست کردبوو و ٤ هێلکەی تێدابوو.

رۆژانە چاودێری هێلکەکانی دەکرد و چاوەڕوانی هەڵترووکانی بوو. بە یانیەك زەمین لەرزەیەکی بەهێز لەناوچەکەی داو یەکێك لە هێلکەکان کەوتە خوارەوە و لەناو کولانەی مریشکێك جێگیر بوو. مریشکەکەش وای زانی کە پێویستە پارێزگاری لە هێلکەی بازەکە بکرێت و چاودێری بکرێت،بەڵام لەبەر سەرقاڵی نەیدەتوانی ئەم کارە بکات، بۆیە ئەم مەسەلەیەی لەگەڵ مریشکێکی بەساڵاچوو باس کرد و ئەویش بڕیاری دا چاودێری هێلکەکە بکات تا ئەو کاتەی دەترووکێت.

هێلکەکە تروکا و بازێکی بچکۆلانەی جوانی لێدەرچوو، بەڵام ئەم بازە بچکۆلانەیە وا راهاتبو کە ئەو مریشکە و بە مریشك خۆی ناسیبوو.

رۆژێکیان ئەم بازە بچکۆلانەیە لە گۆڕەپانی کولانەی مریشکەکان یاری دەرکرد، لە ناکاو کۆمەڵە بازێکی بینی لە بەرزایی ئاسماندا هەڵدەفڕن، ئاواتی خواست کە ئەویش وەك ئەوان بیتوانیبا هەڵبفڕێت، بەڵام ئەم ئاواتەی بە پێکەنینێکی گاڵتە ئامێز لەلایەن مریشکەکانەوە وەڵامی درایەوە و پێیان گوت: تۆ تەنها مریشکێکی و بەس، ناتوانیت وەك ئەم بازانە بفڕیت بۆیە ئەویش وازی لەم خەونە هێنا و بێ ئومێدی ئازاری زۆری پێگەیاند و زۆری پێنەچوو مردار بوویەوە دوای ئەوەی ژیانێکی زۆری وەك مریشك بەسەر برد.

ئەگەر خۆت دا بەدەست ئەو واقیعە نالەبارەی کە تێیدایت، ئەوا دەبیتە دیلی ئەو باوەڕەی کە لات دروست بووە.

ئەگەر تۆ باز بوویت و خەونت بەوە دەبینی کە لەبەرزایی سەرکەوتندا بفڕیت ئەوا بەردەوام بە لە خەونەکانت و گوێ مەگرە لە مریشکەکان (ئەوانەی لە دەوروبەرتن ودەیانەوێت پاشگەزت بکەنەوە لە خەونەکانت) چونکە تۆ تواناو هێزت هەیە بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانت،پاش ویستی خوای گەورە.

ئەوەش بزانە دیدگای خۆت بەرامبەر بەخۆت و ئاواتەکانت سەرکەوتن و شکست خواردنت دیاریدەکەن.

بۆیە هەوڵبدە کارلەسەر خۆت بکەیت و هەموو تواناکانت بەدەرخەی و رێزی زیاتر لەخودت بگرە و دیدگات بۆ زاتی خۆت بەرز تر بکەوە، چونکە ئەمە رێگەی سەرکەوتنتە و.....

لەگەڵ ئەو کەسە بگەڕێ کە ئیرادەت بەهێز دەکات.

# چۆن زیانەکانت دەگۆڕیت بە قازانج

ئەگەر تاکە پێڵاوێکت لێکەوت....یەك تاك.....یان تاکێکت لێ وون بوو.......تەنها یەك تاك!

چی لە تاکەکەی تر دەکەیت؟

دەگێڕنەوە و دەڵێن جارێکیان گاندی بە خێرایی رایدەکرد تا بەشەمەندەفەرێك رابگات... بەڵام شەمەندەفەرەکە دەستی بە جوولە کرد،لە کاتی هەوڵدانی بۆ سواربوونی شەمەندەفەرەکە تاکە پێلاوێکی لێکەوت، ئەویش خێرا تاکەکەی تریشی لەپێ کردەوە و هاوێشتیە نزیك تاکەکەی تر کە لەسەر هێڵی شەمەندەفەرەکە کەوتبوو. هەموو هاورێکانی سەریان سوڕما لەو رەفتارە!

لێیان پرسی: ئەوە بۆ واتکرد؟ بۆچی تاکە پێڵاوەکەی تریشت فڕەدایە خوارەوە؟ گاندی دانا لە وەڵامدا گوتی: حەزم کرد ئەو هەژارەی کە تاکە پێڵاوەکە دەدۆزێتەوە تاکەکەی تریشی لەگەڵ بێت بۆ ئەوەی سوودی لێوەرگرێت، ئەگەر ئەو تەنها تاکە پێڵاوێك بدۆزێتەوە، هیچ سوودێکی لێنابینێت و منیش هیچ سوودێك لەم تاکەی لای خۆم نابینم.....

دەمانەوێت وانەیەك لەم بابەتە فێر بین.

دەکرێت شتێك لەدەستمان بچێت و بەر کەسێکی تر بکەوێت و خۆشی و شادی بۆ بێنێت، دەسا با بەخۆشی ئەو دڵ خۆش بین و بەلەدەست دانی ئەم دەستکەوتە دڵتەنگ نەبین، ئایا دڵتەنگی ئەوەمان بۆ دەگێڕێتەوە کە لە دەستمان داوە؟

چەند جوانە بتوانین ئەو میحنەت و مەینەتیانەی کە رێگەمان پێدەگرن بیانگۆڕین بە بەخشین و دیاری. با سەیری بەشە پڕەکەی ناو پەرداخ بکەین نەك بەشە بەتاڵەکەی.

# کارگێڕی کاریگەر

تێبینی/ ئەم چیرۆکە لە چنینی خەیاڵە، هەر لێکچوونێکیش لە نێوان کەسایەتیەکان یاخود ئەوەی روودەدەن لە نێو هەندێك دەزگاو فەرمانگەکان لەگەڵ ئەم چیرۆکەدا هەبێت ئەوا تەنها قەدەرێکە وای کردوە مەسەلەکان لەیەك بچن.

مێروولەیەکی بچووك، هەموو بەیانیان،زوو، چالاکانە دەهاتە سەرکارەکەی، بێئەوەی سستی بکات یا ن کات بەفیرۆ بدات، ئەو زۆر دڵخۆش بوو چونکە بەچاکترین شێوە بە کارەکانی خۆی هەڵدەستا و ئەرکی سەرشانی خۆی بەجێدەگەیاند، بێ ئەوەی کەس فشاری بخاتە سەر. ئەوەی وای لەم مێروولەیە کردبوو بەم شێوەیە کار بکات، یەکەمیان خۆشەویستی خۆی بوو بۆ کارەکەی، دووەمیشیان خۆشەویستی بۆ ئەو شوێنەی کە کاری تێدا دەکرد، چونکە ئارامی و شادی بۆ هێنابوو. (شێری) سەرۆکیشی زۆر دڵی پێخۆش بوو کاتێك دەیبینی ئەم مێروولەیە بەم گوڕ و تینەوە، بەبێ چاودێری و سەرپەرشتی هیچ کەسێك، بێ ووچان کاردەکات.

(شێر) زۆر بیری لە مەسەلەی کارکردنی ئەم مێروولەیە دەکردەوە، دوای بیرکردنەوەیەکی زۆر لە دڵی خۆیدا گوتی: ئەگەر ئەم مێروولەیە توانای ئەم هەموو بەرهەمەی هەبێت و بەم چالاکی و چوستیە کار بکات بێ ئەوەی هیچ چاودێرێك یان سەرپەرشتیارێکی هەبێت....بێ گومان ئەم بەرهەم و کارکردنە دەبێتە دوو ئەوەندە، ئەگەر هاتوو کەسێك چاودێری یان سەرپەرشتی بکات، بۆیە بڕیاریدا سەرپەرشتیارێکی بۆ دابنێت و بۆ ئەم کارەش (سیسرك) ی هەڵبژارد کە ئەزموون و ناوبانگێکی باشی هەبوو لەبواری نووسینی راپۆرتی نایاب. (سیسرك) بەم کارە رازی بوو دوای ئەوەی (شێر) هەڵیخەڵەتاند بە پێدانی مووچەیەکی زۆر.

---

(سیسرك) پۆستە نوێیەكەی وەرگرت، یەكەم بڕیاریشی دانانی سیستەمێكی توندی ئامادەبوون و دەرچوون بوو، بۆ ئەم مەبەستەش پێویستی بە ئامێرێكی نوێی پەنجەمۆر بوو، شێریش بۆی دابین كرد. سیسرك هەستی كرد پێویستی بە سكرتێرێك هەیە یارمەتی بدات لە ڕێكخستنی كات و چاوپێكەوتن و نووسینی ڕاپۆرتەكانی، بۆ یە (جالَجالۆكە) ی دامەزراند تا ئەرشیفی بۆ ڕێك بخات و چاودێری پەیوەندیە تەلەفۆنیەكان و شتی تر بكات كە لەگەڵ سرووشتی كاری سكرتێراتی ئەمڕۆكەمان دەگونجێت.

(شێر) زۆر دڵی بەم ڕاپۆرتانە خۆش بوو كە (سیسرك) دەربارەی چۆنیەتی بەڕێوەچوونی كار بۆی بەرز دەكردەوە، بۆیە داوی لێكرد چەند خشتەیەك و داتایەكی روونكەرەوەی بۆ ئامادە بكات كە تێكڕای بەرهەم، شیكردنەوەی باری بازاڕ و ئاراستەكانی پیشان بدات تاوەكو لە كۆبوونەوە ئاساییەكانی ئەنجوومەنی كارگێڕی وەك بەڵگە نمایشی بكات و بەكاریبێنێت.

ئەم داوایەی (شێر)، (سیسرك)ی ناچار كرد ئامێرێكی كۆمپیوتەری نوێ و بەرنامەی (پاوەر پۆینت) بكڕێت لەگەڵ ئامێرێكی چاپی (لێزەری) و كردنەوەی بەشێكی نوێ بۆ بەشی كۆكردنەوەی زانیاری (ئای تی)، بۆ سەرپەرشتیكردنی ئەم بەشەش (مێش) ێكی هەڵبژارد كە بەناو بانگ بوو لە تواناكانی لە بواری تەكنیكیدا.

(مێروولە) ڕای لەو كارە نەدەكرد كە تەنها نووسین بوو لەسەر كاغەز، تەنانەت رقیشی لەو كۆبوونەوە بێ سوودانە هەڵسا بوو كە (سیسرك) دەیبەستا و ببوە مایەی كوشتنی كات و لەكاری دەكردن، كەچی (شێر) دڵی زۆر خۆش بوو بەم گۆڕانكاریانە. دوای فراوان بوونی سنووری كار و لق و پۆپی زۆری لێكەوتەوە، (شێر) بڕیاریدا بەڕێوەبەرێكی كارگێڕی دابمەزرێنێت بۆ ئەوەی ڕیتمی كارەكان ڕێك

بکات و (زەنگە سوورەی) بۆ ئەم کارە هەڵبژارد چونکە چەندین بڕوانامەی بەرزی لە گەورەترین زانکۆکانی رۆژئاوا بەدەست هێناوە لە بواری کارگێڕی نوێ.

لەگەڵ دەست بەکاربوونی (زەنگە سوورە) فەرمانی کرد بە کڕینی فەرشێك کە شیاوی نووسینگەکەی بێت، هەروەها داوای جۆرە کورسیەکی نوێی کرد کە تایبەتمەندی خۆی هەیە و لەگەڵ کاتژمێرەکانی کارکردن لە نووسینگەکەیدا دەگونجێت، ئەڵبەتە پێویستی بە ئامێرێکی کۆمپیوتەر و یاریدەدەرێك هەبوو تا یارمەتی بدات لە راپەڕاندنی کارە کارگێڕیە نوێیەکەی و چەندین کاری تریشی پێ سپارد، یەکێك لەمانە دانانی میزانیە بوو بۆ ئەو پلانە ستراتیژیەی کە بەتەمانە کاری لەسەر بکەن، ئیتر ئەو شوێنەی کە مێروولە کاری تێدا دەکرد و شادی پێبەخشیبوو بوو بە شوێنێکی ناخۆش و ناحەزبزە لەسەر لێوی ئەو کارمەندانە نەما کە کاتی خۆی جۆرەها شێوازیان بەکار دەهێنا بۆ رازیکردنی سەرۆکەکانیان و دڵە راوکێ و هەڵچوون بوو بە فاکتەری هاوبەش لە نێوانیان.

دوای ئەم هەموو گۆڕانکاری و پارە خەرجکردنە، (شێر) تێبینی ئەوەی کرد کە بەرهەم زۆر لەکەمی داوە، و بڕی پارەی خەرجکراو بەشێوەیەك زیادی کردوە کە ناگونجێت لەگەڵ بڕی بەرهەمی دەستکەوتوو، بۆیە بڕیاریدا لێکۆڵینەوەیەك لەسەر شوێنی کارکردن ئەنجام بدات تاوەکو خەوشەکە بدۆزێتەوە.

لەبەر ئەوەی ئەم کارە کەسێکی پسپۆڕی خاوەن ئەزموونی پێدەوێت، (کوندە پەپوو) ی دیاریکرد بۆ راپەڕاندنی ئەم کارە، چونکە ئەو پایەیێکی تایبەت و شۆرەتێکی زۆر و ناوبانگێکی باشی هەیە لەم بوارەدا، ئیتر بە مووچەیەکی خەیاڵی و وەك ((راوێژکار)) ی کارگێڕی دەست بەکار بوو و پێشەکیەکی زۆر گەورەشی پێدرا چونکە خواستی زۆری لەسەر بوو. (شێر) داوای لە (کوندە پەپوو) کرد وردبینی لەم مەسەلەیەدا بکات و داوای چارەسەری گونجاویشی لێکرد بۆ ئەم کێشەیە.

وەك خووی شارەزایان و راوێژکاران کە بەردەوام شت کەورە دەکەن و کاتێکی زۆر دەکوژن بە لێکۆڵینەوە و توێژینەوە، ئەم (کوندە پەپوو) یە بەم شێوەیە وێنای کارەکەی بۆ (شێر) کێشا و پێی گوت کارەکە ئاسان نیە!...، چارەسەریەکەشی بەم شێوەیە ئاسان نیە کە پێشبینی دەکەی! بەڵێ من کاتم پێدەوێت تا چارەسەری گونجاو دەدۆزمەوە........

(کوندە پەپوو) نزیکەی ساڵێك خەریکی هەڵگێڕ و وەرگێڕی تێنووسەکانی فەرمانگەکە بوو، هێڵەکانی بەرهەمهێنان و دەرکردە و هاوردەی پشکنی بەر لەوەی کۆتایی بە راپۆرتەکەی بێنێت!. ئەم راپۆرتە هێندە وورد بوو پیاو پێویستی بە چەندین کاتژمێر بوو بۆ خوێندنەوە و تێگەیشتنی.

لە کۆتاییدا گەیشتە ئەنجامێك ئەویش بوونی هەڵاوسانێکی زۆری پیشەیە لە فەرمانگەکە و تاکە چارەسەریش بۆ ئەم کێشەیە لادانی ئەو فەرمانبەرانەیە کە بوونەتە بارگرانی لەسەر فەرمانگەکە

(شێر) لەدوای ئەم لێکۆڵینەوەی کە پارەیەکی زۆری تێچو، هیچی پێنەما جگە لە مل کەچ کردن بۆ ئەو چارەسەریەی کە (کوندە پەپوو) لە راپۆرتەکەدا بۆی دانابوو، بەڵام ئاخۆ دەبێت یەکەم قوربانی دەرکردن لەم دەزگایە کێ بێت؟

ئەم قوربانیە (مێرووله) بوو چونکە لە راپۆرتەکەدا وا هاتبوو کە ئەم مێروولەیە،پاڵنەری کاری تێدا نەماوە و هەڵوێستی نێگەتیڤانەی هەبوە لەو گۆڕانکاریانەی کە لە دەزگاکە روویانداوە، لە کاتێکدا ئەم دەزگایە پێش گۆڕانکاریەکان بەرهەمەکەی گەلێك زۆرتر بوو و ژینگەی کارکردنیش تیایدا زۆر باشتر بوو لە ئێستاکە کە بووەتە ژینگەی دەرکردنی کارمەندان و هانی کار و بەرهەمهێنان نادات.

# لە وانەکانی ژیان

منداڵێك هاتە ناو دوکانێکی سەرتاشین.....

خاوەن سەرتاشخانەکە بەگوێی مەعمیلەکەیدا چرپاندی و گوتی: ئەمە گێلترین منداڵە لە جیهان.....بزانە چۆن ئەمەت بۆ دەسەلمێنم.سەرتاشەکە درهەمێکی لەدەستێکی دانا و ٢٥ فلسیش لەدەستەکەی تر. بانگی منداڵەکەی کرد و هەردوو برە پارەکەی لەپێش منداڵەکە داناو داوای لێکرد بە ئارەزووی خۆی یەکێکیان بۆخۆی ببات، ئەویش ٢٥ فلسیەکەی برد و رۆیشت.

سەرتاشەکە گوتی: پێم نەگوتی ئەم کورە هەرگیز فێر نابێت.....هەموو جارێك هەمان شت دووبارە دەکاتەوە !.

کە مەعمیلەکە لە سەرتاشخانەکە هاتە دەرەوە، چاوی بە منداڵەکە کەوت لە دوکانی ئایس کرێم دەهاتە دەرەوە، تێنەگەیشتنی لەم مەسەلەیە وای لێکرد لە منداڵەکە بچێتە پێش و لێی پرسی: بۆچی هەموو جارێك ٢٥ فلسی هەڵدەگریت و ودرهەمەکە نابەیت؟

منداڵەکە گوتی: لەبەر ئەوەی ئەگەر درهەمەکە هەڵگرم یاریەکە تەواو دەبێت...!

هەندێك جار وای بۆدەچی کە خەڵك ژیریەکەیان کەمترە لەوەی شایەنی رێزلێنانی تۆ بن بەرامبەر راستی ئەو کارانەی کە ئەنجامی دەدەن، کەچی راستیەکە نەزانی تۆیە ئەوان بە بچووك دێنێتە بەرچاوت، هیچ مرۆڤێك یان هیچ کەسێك بە کەم مەزانە، کەم و کوریش لەکەس مەدۆزەوە.

**لا تستحقرن صغيراً على صغره   فالبعوضة تدمي مقلة الاسد**

واتە: هیچ بچوکێك لەبەر بچووکیەکەی بەکەم مەزانە، ئەوتا مێشوولە خوێن لە چاوی شێر دێنێت.

## حیکمەتیکی پەروەردەیی مەزن
## بۆ هەموو دایکێك و هەموو تاکێك

لەخەودا بینی.....کوڕەکەی ئاگر لە دەنکە شقارتە بەردەدات و......لە چاوەکانی نزیکی دەکاتەوە تا چاوەکانی سوور هەڵگەڕان......

لەخەو هەڵسا......و دەستی کرد بە پەنا بردن بۆ خوا لەدەست شەیتانی نەفرەتی...

بەڵام دڵی ئۆقرەی نەگرت......بۆیە روە و ژووری کوڕە حەڤدە ساڵانیەکەی رۆیشت....

بینی وا لە بەرامبەر کۆمپیوتەرەکەی دانیشتوە.....

رووناکی شاشەی کۆمپیوتەرەکە لە پەنجەرەی ژوورەکەدا دەشکایەوە.....ئەو بینی کوڕەکەی سەیری چی دەکات بۆیە......ترسی بۆ دروست بوو.

ئەو کوڕەکەی بینی.....لەسەر شاشەی کۆمپیوتەر.......سەیری فیلمێکی رووت دەکات

ویستی لەرووی بقیڕێنێت، بەڵام پێی باشتر بوو لە ژوورەکە بێتە دەرەوە... بە تایبەت کە کوڕەکەی ئاگای لە هاتنە ژوورەوەی نەبوو.

دایکەکە گەڕایەوە ناو پێخەفەکەی خۆی.....بیری لەوە کردەوە کە بە هاوسەرەکەی بڵێت....تا بەرپرسیاریەتی سزادانی کوڕەکەی بگرێتە ئەستۆ... نەجارەیان بە خەیاڵی داهات کە بچێت کۆمپیوتەرەکە دابخات و سەرزەنشتی بکات لەسەر ئەو کردەوەی کە کردوویەتی و سزای بدات......ئەوەشی نەکرد بەڵکو داوای کۆمەکی لەخوا کرد کە بەیانی بڕیارێکی دروست بدات. بەم شێوەیە پەنای بە خوا گرت و خەوت.

بەیانی هەموو لە خەو هەڵسان....بینی کوڕەکەی خۆی بۆ قوتابخانە ئامادە دەکات...
هەردووکیان بە تەنیا بوون... پێی وابوو هەلێکی باشە بۆ گفتوگۆ کردن.. بۆیە لێی پرسی
عیماد: رات چیە بەرامبەر کەسێکی برسی؟ پێت وایە چیدەکات تاکو تێر بیت؟.
ئەویش بە ئاسانی وەڵامی دایەوە و گوتی: دەچێتە چێشتخانە و شتێك دەکڕێت و دەیخوات
دایکی گوتی: ئەگەر پارەی پێنەبوو..........؟
لێرەدا بێدنگ بوو وەك بڵێی لە شتێك گەیشتبێت، واتە گەر پارەی نەبوو با نەیخوات.....
دایکی گوتی: ئەی ئەگەر ئارەزوو کەرەوەیەکی خوارد......تۆ چی پێدەڵێیت؟
خێرا وەڵامی دایەوە و گوتی: بێ گومان شێتە... چۆن ئارەزووی بۆ خواردنێك دەکاتەوە... کە نرخەکەی لا نیە.....
دایکی گوتی: تۆ بەشێتی دەزانی کوڕەکەم؟
وەڵامی دایەوە: بە دڵنیاییەوە شێتە دایکە گیان... ئەو کەسە وەك ئەو زامدارە وایە کە خوێ بە برینەکەی دادەکات.
لێرەدا دایکەکە بە بزەخەنەیەکەوە پێی گوت: تۆش وەك ئەم شێتە دەکەیت کوڕەکەم.....
عیماد گوتی: من دایکە گیان!
دایکی گوتی: بەڵێ... بەسەیرکردنت بۆ ئەو شتانەی کە ئارەزووت بۆ ئافرەت دەکەنەوە...
لێرەدا عیماد لە شەرما بێدەنگ بوو و سەری دانەواند.....

دایکی گوتی: کوڕەکەم تۆ لەو کەسە شێت تری... ئەو ئارەزووی بۆ شتێك کردۆتەوە کە لای نیە.. ڕاستە ڕەفتارەکەی حەکیمانە نیە... بەڵام خۆ حەرام و قەدەغە کراو نیە...

کەچی تۆ ئارەزووی خۆت بۆ شتێك کردەوە کە قەدەغە کراو و حەرامە... ئایا فەرموودەی خوا گیانت لە بیرکرد کە دەفەرموێت: ﴿قُل لِّلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ وَيَحْفَظُوا فُرُوجَهُمْ ۚ ذَٰلِكَ أَزْكَىٰ لَهُمْ ۗ إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا يَصْنَعُونَ ﴿٣٠﴾﴾ (النور: ٣٠)

واتە: ئەی موحەممەد بە بڕواداران بڵێ با چاوەکانیان داگرن و داوێنیان پاك ڕاگرن، ئەمە بۆوان باشترە خودا زاناو ئاگادارە بەوەی کە دەیکەن.....

لێرەدا فرمێسك لە چاوەکانی عیماد هاتە خوار و بە دایکی گوت: ڕاست دەکەی دایە گیان من هەڵەم کرد....ئەگەر جارێکی تر بۆ ئەم کارە گەڕامەوە......ئەوا لەو پیاوە شێت ترم.....بەڵکو گوناە باریشم....بەڵێن بێت دووبارەی نەکەمەوە.

# ئەمە چیرۆکێکی خۆشەویستیە هەرگیز لە یادی ناکەی

لە ئاهەنگێکدا چاوی پێکەوت....

کچێکی سەرنج راکێش بوو....زۆرێك لە گەنجان بەدوای دەکەوتن، بەلأم ئەو کورێکی ئاسایی بوو و سەرنجی کەسی بەلای خۆیدا رانەدەکێشا. لە کۆتایی ئاهەنگەکە لێی نزیك بوویەوە و بە فینجانێك قاوە داوەتی کرد.....کچەکە ئەم داواکاریەی لا سەیر بوو....بەلأم ئەدەبی کچەکە وای لێکرد کە داوەتەکەی قبوولٚ بکات. لە قاوەخانەیەك دانیشتن، ئەو زۆر شپرزە بوو بۆیە نەیتوانی قسە بکات، کچەکەش هەستی بە نا ئاسوودەیی دەکرد، بۆیە ویستی مۆڵەت بخوازێت و بڕوات، لە ناکاو کوڕەکە ئاماژەیەکی بۆ گارسۆنەکە کرد و پێی گوت:

تکایە... هەندێك خوێم دەوێت بۆ قاوەکەم!

هەموو بە سەرسوڕمانەوە سەیری ئەو کوڕەیان کرد، ئەویش روخساری سوور هەڵگەڕا، بەلأم لەگەڵ ئەمەشدا خوێیەکەی لە قاوەکە کرد و خواردیەوە. کچەکە پرسیاری لێکرد: (بۆ ئەم خوە؟)

کوڕەکە: مەبەستت خوێ کردنە ناو قاوە یە؟ لە راستیدا من کە منداڵ بووم، لە نزیك دەریا دەژیام، ئێستاکەش هەرکاتێك قاوەی سوێر دەخۆمەوە کاتی منداڵیم، شارۆچکەکەم، دێتەوە خەیاڵ، بیری دایك و باوکم دەکەم کە تا ئێستاش هەر لەوێ ژیان بەسەر دەبەن. لەگەڵ ئەم قسانە چاوەکانی پڕ بوون لە فرمێسك...قسەکان زۆر کاری تێکردن چونکە لە ناخی دڵیەوە دەرچوون.

ئەو پیاوەی کە بتوانێت شەیدایی خۆی بۆ نیشتمانەکەی دەربڕێت، ئیللا دەبێت خۆشی بوێت و گرنگی پێبدات، هەست بە بەرپرسیاریەتی دەکات بەرامبەر ی و بەرامبەر خێزانەکەی.

ئەمجارە کچەکە دەستیکرد بە باسکردنی قۆناغی منداڵی خۆی و خێزانەکەی، لە راستیدا گفتوگۆیەکی خۆش بوو.

بەردەوام بوون لە یەکتر بینین، لە کۆتاییدا بۆی دەرکەوت کە ئەوە ئەو پیاوەیە کە بەدوایدا دەگەڕا و ئەو سیفەتانەی کە دەیویست لە هاوسەری ژیانیدا هەبێت لەو کوڕەدا هەیە، کوڕێکی زیرەك، باش، بەسۆز، خەمخۆر....

وای لێهات دڵبەستەگی ئەم کوڕە بێت و، سوپاسگوزاریش ئەڵبەتە دەگەڕێتەوە بۆ قاوە سوێرەکە!.

چیرۆکەکە هەروەکو هەر چیرۆکێکی ترە

شازادە شازادە دەخوازێت

ژیانێکی زۆر خۆشیان بەسەر برد

هەرچەند جاری قاوەی بۆ ئامادە دەکرد، ئەوا خوێی بۆ لەقاوەکە دەکرد چونکە لای وابوو هاوسەرەکەی حەزی لە قاوەی سوێرە

دوای چل ساڵ ئەم پیاوە کۆچی دوایی کرد و نامەیەکی بۆ خێزانەکەی جێهێشت کە ئەمە ناوەرۆکەکەی بوو:

ئازیزەکەم، تکایە ببەخشە، ببەخشە لەسەر گەورەترین و تاکە درۆی ژیانم... کە لەگەڵ تۆم کردبێت....قاوەی سوێر!

یەکەم چاوپێکەوتنمانت لە یادە؟ ئەوکات من شلەژاو پەشۆکاو بووم، ویستم داوای

شەرمم کرد لە قسەکەم پاشگەز ببمەوە و بەردەوام بووم، هەرگیز چاوەڕوانی ئەوەم نەدەکرد کە ئەمە ببێتە سەرەتای بەیەکەوە گرێدانمان!.

دوای ئەم ڕووداوە ویستم ڕاستیەکەت پێبڵێم، بەڵام ترسام! بۆیە بڕیارم دا بەهیچ شێوەیەك درۆت لەگەڵ نەکەم........

ئێستاکە من لەسەرە مەرگدام....بۆیە ناترسم لە گوتنی ڕاستیەکە

من حەز بە قاوەی سوێر ناکەم! ئای کە چ تامێکی سەیری هەیە!

بە درێژایی ژیانم لەگەڵ تۆ قاوەی سوێرم خواردەوە و هیچ هەست بە پەشیمانی ناکەم چونکە بوونم لەگەڵ تۆ هەموو شتێکی داپۆشیبوو.

ئەگەر ژیانێکی ترم هەبا ئەوا لەگەڵ تۆدا بەسەرم دەبرد.....ئەگەر ناچار بام جارێکی تریش قاوەی سوێری بخۆمەوە.

فرمێسکەکانی هاوسەرەکەی نامەکەی نقوم کرد

ڕۆژێکیان یەکێك لەو ژنەی پرسی: تامی قاوەی سوێر چۆنە؟

گوتی: شیرینە.

# هونەری گوێگرتن

شەمەندەفەرەکە لە یەکێك لە وێستگەکانی شاری بۆستنی ئەمریکی وەستا و ژن و مێردێکی لێهاتە دەرەوە کە جل و بەرگێکی سادەیان پۆشیبوو. ژنەکە جلێکی لە لۆکەی پۆشیبو، هەرچی پیاوەکەشە چاکەت و پانتۆڵێکی سادە کە لە درووێنەی خۆی بوو. زۆر بەشەرمەوە هەنگاویان نا بۆ نووسینگەی سەرۆکی زانکۆی (هارفارد)، ئەوان پێشتر مۆڵەتی چاوپێکەوتنیان وەرنەگرتبوو. بەڕێوەبەری نووسینگەکەی سەرۆکی زانکۆ بە دوو دێهاتیەکەی گوت: (سەرۆك زۆر سەرقاڵە، ناتوانێت بەم زوانە چاوی پێتان بکەوێت....). وەلامی ژنەکە زۆر خێرابوو، بە متمانەوە پێیگووت: باشە چاوەڕێی دەکەین.

ئەم دوو هاوسەرە بۆ چەندین کاتژمێر لە نووسینگەکە مانەوە چاوەڕوانی ئەوەیان دەکرد کە چاویان بە سەرۆك بکەوێت، هەرچی سکرتێرەکەش بوو بە ئەنقەست پشت گوێی خستبوون تابێزار بن و نووسینگەکە جێبێڵن، بەلاّم نەخێر، ئەوان بۆشتێکی گرینگ هاتوون بۆیە پێناچێت بە ئاسانی بڕۆن. لەگەڵ تێپەڕ بوونی کات و سووربوونی ژن و مێردەکە لەسەر بینینی سەرۆکی زانکۆ توڕەیی سکرتێرەکە بەرە بەرە لە زیاد بووندا بوو، بۆیە بڕیاریدا کۆبوونەوەی سەرۆکەکەی بپچڕێت و تکای ێکرد بۆ چەند خولەکێك چاوی بەم دووهاوسەرە بکەوێت.

سەرۆك بە تووڕەییەوە سەری لەقاند و نیشانەی بێزاری لەسەر دەم و چاوی بەدەر کەوت، ئاخر ئەوانەی کە لە پایەی ئەون تەنها کاتی ئەوەیان هەیە چاویان بە گەورە پیاوانی وولاّت بکەوێت، جگە لەمەش ئەو رقی لە خەڵکی دیهاتەو لەجل و بەرگی

لۆکە. بەهەر جۆرێك بێت رازی بوو بۆ چەند خولەکێك چاوی پێیان بکەوێت تا ناچار بن برۆن.

کە هاتنە ناو ژووری سەرۆکی زانکۆ، ژنەکە باسی لەوە کرد کە کوڕێکیان هەبوو بۆ ماوەی ساڵێك لە (هارفارد) ی خوێندوە، بەلاّم لە رووداوێکدا گیانی لەدەست داوە.دایکەکە بەردەوام لە قسە کردن و گوتی: لەبەر ئەوەی ئەم ماوەیەی کە لەم زانکۆیەدا بەسەری بردووە دڵی زۆر خۆش بوو، بۆیە بڕیارماندا بڕێك پارە بە زانکۆکە ببەخشین بۆ زیندوو راگرتنی ناوی کوڕەکەمان.

قسە کانی ئەم ژنە کاریان لە سەرۆکی زانکۆ نەکرد بۆیە بە زبری وەلاّمی دایەوە و گوتی:

خانمەکەم، ئێمە ناتوانین باڵەخانەیەك دروست بکەین و یادی هەموو ئەو کۆچ کردوانە بکەینەوە کە لە (هارفارد) خوێندوویانە، ئەگەر وابێت زانکۆکە دەبێت بە دارستانێك لە باڵەخانە و پەیکەری بیرەوەری.

ژنەکە وەلاّمی دایەوە و گوتی: ئێمە گەرەکمان پەیکەر نیە، بەڵکو دەمانەوێت باڵەخانەیەك بەدیاری پێشکەش بە زانکۆی (هارفارد) بکەین ناوی کوڕەکەمانی لەسەر بێت..... ئەم قسانە هیچ مەودایەکی نەبوو لەلای سەرۆکی زانکۆ، بۆیە بە تووڕەییەوە سەیرێکی جل و بەرگە لۆکەییەکە و قاتە شڕۆڵەکەی کرد و بە گاڵتە پێکردنێکەوە گوتی: ئێوە بیرۆکەتان هەیە دەربارەی تێچووی باڵەخانەیەکی لەم شێوەیە؟ دروستکردنی باڵە خانەکانی ئێمە نزیکەی حەوت ملیۆن دۆلار و نیوی تێچوە!.

بێدەنگیەك رووی لە ژوورەکە کرد، سەرۆك وای زانی کە ئیتر ئەم دوانە نووسینگەکەی جێدێلن، بەلاّم ژنەکە رووی لە هاوسەرەکەی کردەوە و گوتی:

(بەڕێز ستانفۆرد ئەگەر ئەمە تێچووی زانکۆیەك بێت بۆچی زانکۆیەك دانەمەزرێنین، هەڵگری ناوی کوڕەکەمان بێت)؟ هاوسەرەکەی سەری خۆی لەقاند کە بەم بیرۆکەیە رازیم.

هەردوو هاوسەر (لیلند و جین ستانفۆرد) سەرۆکی زانکۆی هارفاردیان بە سەرسوڕماوی و پەشیمانی جێهێشت، و بەرەو کالیفۆرنیا بەڕێکەوتن، لەم ویلایەتەدا زانکۆی ستانفۆردی دێرینیان دامەزراند و تا ئێستا هەر هەڵگری ناوی ئەم خانەوادەیە یە و یادی کوڕەکەیانی بەرز راگرتوە. ئەو کوڕەی کە لای سەرۆکی زانکۆی (هارفارد) هیچ نرخێکی نەبوو، ئەم رووداوەش لە ساڵی ١٨٨٤ ز روویدا.

بەراستی وایە....زۆر گرنگە بەردەوام گوێگر بین، کاتێکیش کە گوێمان گرت بە جوانی لە بەرامبەرەکە تێبگەین.... زۆر گرنگە لەسەر بنەمای جل و بەرگ و هەندام و شێوازی قسەکردن، شێوەزار، بڕیار لەسەر خەڵك نەدەین، زۆر گرنگە (کتێبێك نەخوێنینەوە لەبەر ناونیشانەکەی)، ئەگەر نرخەکەشی حەوت ملیۆن و نیو بێت و لە ساڵی ١٨٨٤ بێت.

چیرۆکێکی راستەقینەیە (مالکۆم فۆربز) گێڕایەوە و تا ئەو ساتەش (ناوەکانی خانەوادەی ستانفۆرد) لە سەر باڵەخانە و گۆڕەپانەکانی ئەم زانکۆیە نەخشێنراوە.

# دەستی دۆستت بگرە

دەگێڕنەوە رۆژێکیان کچێکی بچکۆلانە لە گەڵ باوکە بەساڵا چوەکەی لە سەر پردێکدا دەپەڕینەوە، باوکە بەسۆزەکە لە کەوتنە خوارەوەی کچەکەی ترسا بۆیە پێی گوت:خۆشەویستەکەم، باش دەستم بگرە با نەکەویتە ناو رووبارەکەوە. کچەکەش خێرا و بێ دوودڵی وەڵامی دایەوە و گوتی: نەخێر باوکە.....تۆ دەستی من بگرە!

باوکەکە بە سەر سوڕمانەوە گوتی: جا ئەمە چ جیاوازیەکی هەیە؟

خێرا وەڵامی دایەوە و گوتی: ئەگەر من دەستی تۆ بگرم بۆی هەیە نەتوانم کۆنترۆڵی جوولەکانم بکەم و دەستم لەدەستت بیێتەوە و بکەومە خوارەوە.

بەڵام ئەگەر تۆ دەستی منت گرت، ئەوا هەرگیز ناهێڵیت لە دەستت دەرچێت......

کاتێك متمانەت بەوکەسەی کەخۆشت دەوێت زیاتر بوو لە متمانەت بەخۆت...

دڵنیاش بوویت لەوەی کە ژیانت لای ئەوان پارێزراوترە لە وەی کە لە نێو دەستی خۆتە......

لەوکاتەدا دەستی ئەو کەسە بگرە کە خۆشت دەوێت.....بەر لەوەی چاوەڕێی ئەوە بیت دەستت بگرن.

# وانەیەکی نایاب

پیاوێك چوار کوڕی هەبوو، ویستی وانەیەکی نایابیان لە ژیان فێربکات ئەویش خێرا بڕیار نەدانە لەسەر شتەکان و بینشیان بۆ شتەکان سەرزارەکی نەبێت.

باوکەکە کوڕەکانی بۆ شوێنێکی دوور ڕەوانە کرد و پێی گوتن: ئەم شوێنە دارێکی گەورەی تێدایە، داوام لێتان ئەوەیە کە گەڕانەوە هەریەکەتان شێوە و وەسفی ئەم دارەم بۆ بکات.

کوڕە گەورەکە لە زستانا چوو بۆ ئەم شوێنە و کوڕی دووەمی لە بەهاردا، هەرچی سێیەمە لە هاویندا چوو و چوارەمیش لە پاییزدا. کە لەگەشتەکەیاندا گەڕانەوە باوکەکە هەموویانی کۆ کردەوە و داوای لە هەر چواریان کرد وەسفی دارەکەی بۆ بکەن.

کوڕی گەورە گوتی: بەڕاستی ناحەز و ناشیرین و ووشك بوو.

دووەمیشیان گوتی: دارێکی سەوز و گەڵادار بوو.

کوڕی سێیەم بە سەرسوڕمانەوە گوتی: ئەو داپۆشرابوو بە گوڵ و گوڵزاری بۆن خۆش و لە ترۆپکی جوانیدا بوو.

کوڕی چوارەمیش گوتی: بەرێکی زۆر و پڕ بوو لە ژیان.

باوکەکە گوتی قسەکانتان هەمووی ڕاستە چونکە هەریەکەتان لە وەرزێکدا دارەکەی بینیوە

باوکەکە بەردەوام بوو لە قسەکانی و گوتی: نابێت لە وەرزێکدا بڕیار لەسەر دارێك بدەین، بەهەمان شێوەش نابێت بڕیار لەسەر کەسێك بدەین لەسەر هەڵوێستێکی

بۆیە ئەگەر خۆت دایە دەست زستان ئەوا هەموو جوانی بەهار و هەستی ناسك و نایابی هاوین و پاییز لەدەست دەدویت.

## حیکمەتی بنەڕەتی:

مەهێڵە ئەو ئازارەی کە لە وەرزێکی دیاریکراودا پێت دەگات وات لێبکات بێبەش بیت لە خۆشی بینین لەگەڵ کەسانی تر.

بڕیار لەسەر ژیان مەدە لە روانگەی هەڵوێستێك یان شێوەیەك.

هەوڵبدە بەسەر دۆخە سەختەکان و هەڵوێستە ناخۆشەکان باز بدەیت، چونکە خوای گەورە کاتی خۆش تر و ژیانی باشتری بۆ ئامادە کردوویت.

## جگە لە هاوسەرەکەم دەستم کرد بەدەرچوون لەگەڵ یەکێکی تر

دوای ٢١ ساڵ لە زەماوەند کردنم، تروسکاییەکی نوێی خۆشەویستیم دۆزیەوە بەر لەماوەیەك جگە لە خێزانەکەم دەستم کرد بە دەرچوون لەگەڵ ئافرەتێکی تر، ئەمەش بیرۆکەی خێزانەکەم بوو، ئەو پێی گوتم: (چاك دەزانم چەندت خۆش دەوێت)..........

ئەو ژنەی کە هاوسەرەکەم حەزی دەکرد لەگەڵی دەربچم و کاتی لەگەڵ بەسەر ببەم دایکم بوو. بەر لە ١٩ ساڵ باوکم کۆچی دوایی کرد، بەڵام سەرقاڵ بوونم لە کار لەلایەك و ژیانی رۆژانەم لەگەڵ ٣ منداڵدا لەلایەکی تر وای لێکردم بە دەگمەن سەردانی بکەم.

رۆژێکیان پەیوەندیم پێوەکرد و داوەتی خوانێکی ئێوارەم کرد، لێمی پرسی: (تۆ باشیت)؟ ئەم پرسیارەی لەبەر ئەوە بوو کە زوو زوو بە تەلەفۆن قسەم لەگەڵی دەکرد بەڵام ئەم ماوەیە تۆزێك دوا دەکەوتم لە پەیوەندی کردن، بۆیە تووشی دڵە راوکێ ببوو، منیش پێم گوت:

(بەڵێ من زۆر باشم بەڵام حەز دەکەم کاتێکی تایبەتت لەگەڵ بەسەر بەرم دایکە گیان)

گوتی: (هەردووکمان بەتەنیا)؟! تەختێك بیری کردەوە، پاشان گوتی (باشە منیش زۆرم پێخۆشە).

رۆژی پێنج شەممە و دوای دەست هەڵگرتنم لە کار، بە دوایدا چووم، تۆزێك شپرزە بووم، کە گەیشتمە بە دەرگای ماڵی باوکم بینیم لەبەر دەرگا چاوەڕوانە و

شپرزەیی پێوە دیار بوو، جلێکی جوانی پۆشیبوو، پێدەچێت دواهەمین کراس بێت که باوکم بۆی کرِیبێت بەر لە فەوت کردنی.

وەك فریشتەیەك بزەیەکی لێوە هات و گوتی ((بەهەمووانم گوت ئەمرۆ لەگەڵ کورِەکەم دەردەچم، هەموو دڵ خۆش بوون، پێدەچێت نۆقرە نەگرن تا دێمەوە و باسی وورده کاریەکانیان بۆ بکەم)).

چووین بۆ چێشتخانەیەکی تایبەت، زۆرجوان و ئارام بوو، دایکم دەستی کرد بە قۆڵما هەروەك بڵێی خانمی ژمارە یەك بێت.

دوای دانیشتنمان دەستم کرد بە خوێندنەوەی لیستی ناوی خواردنەکان ئەو بە بزەخەنەیەکی سەر لێوە لۆچ گرتوەکانی سەیری دەکردم، چونکە چاوەکانی کز بوونە و تەنها پیتی گەورەی پێدەخوێندرێتەوە. خوێندنەوەکەی پێبرِیم و گوتی: ((کە تۆ بچووك بویت من بۆتم دەخوێندەوە))

منیش وەلاٌمم دایەوە و گوتم: (ئێستاکە وادەی دانەوەی برِێکی کەمی ئەم قەرزەی سەرشانمە دایکە گیان.....تۆ پشوو بدە)

لە کاتی نان خواردندا زۆرمان قسە کرد، هیچ شتێکی نا سرووشتی نەبوو، تەنها چیرۆکی کۆن و نوێ نەبێت، بە شێوەیەك کاتمان فەرامۆش کردبوو و کەوتبووینە دوای نیوەی شەو و ئاگامان لەخۆمان نەبوو.

کە گەیشتینەوە بەردەرگای ماڵی دایکم پێی گوتم: ((رازیم جارێکی تر بەیەکەوە دەربچین بەمەرجێك ئەمجارە من پارەکە دەدەم)) منیش دەستەکانیم ماچ کرد و ماڵئاواییم لێکرد.

دوای چەند رۆژێکی کەم دایکم بەهۆی نۆرەی دڵەوە کۆچی دوایی کرد. ئەم شتە زۆر خێرا روویدا و هیچم لەدەست نەدەهات بۆی.

دوای  چەند ڕۆژێك نامەیەکم لەڕێی پۆستەوە لەو چێشتخانە پێگەیشت کە ئەو شەوە لەگەڵ دایکم نانی ئێوارەمان لێی خواردبوو، تێبینیەك لە نامەکە هەبوو کە بە دەستی خۆی نووسیبووی:

((پێشتر پارەی خواردنەکەم دا، دەمزانی من ئامادە نابم، ئەوەی گرنگە من پارەی خواردنی دوو کەسم داوە، هی خۆت و هاوسەرەکەت.........)).

تۆ نازانی  ئەو شەوە لای من چ بەهایەکی هەبوو........خۆشمدەوێیت کوڕەکەم)).

ئا لەم کاتەدا مانا و قەدری ووشەی (خۆشەویستی) و (خۆشم دەوێیت) م زانی، لەم کاتەدا تێگەیشتم چ مانایەك دەگەیەنێت کاتێك تۆ وا لە لایەنی بەرامبەرت دەکەیت هەست بە  خۆشەویستی تۆ بکات بەرامبەر بەو.

هیچ شتێك گرنگ تر نیە لە دایك و باوك، بە تایبەت دایك.....ئەوندە کاتەیان پێبدە کە شایەنین...

ئەمە مافی خوا و  مافی ئەوانە، ئەم کارانەش دوا ناخرێن.

دوای خوێندنەوەی ئەم بەسەر هاتە، چیرۆکی ئەم پیاوەم هاتەوە یاد کە لە عبداللە ی کوڕی عومەری پرسی: دایکم زۆر پیرە و ناتوانێت بجووڵێت، بۆ هەموو شوێنێك بە کۆڵمی دادەدەم تەنانەت بۆ سەر ئاویش....هەندێك جاران خۆی بۆ ناگیرێت و بەمنی دادەکات.....پێت وایە مافی دایکم دابێت......؟.

عبداللە وەڵامی دایەوە و گوتی: ناکاتە یەك پێچە ژانی لەدایك بوونت....ئەوەی بۆ دەکەی و بە هیوای  مردنی ئەوی  تاوەکو  لەدەستی بحەسێیەوە، کەچی تۆ لە منداڵیدا هەمان شتت دەکرد بەڵام دایکت  هیوای دەخواست تۆ بژیت.

# پرسیارێك و حیكمەتێك

پسپۆڕێكی نەشتەرگەری دڵ ئوتومبێلەكەی لای تەكنیكارێكی ئوتومبێل (فیتەر) چاك دەكردەوە. ئەم تەكنیكارە خەریكی كردنەوەی بزوێنەری ئوتومبێلەكە بوو شتێكی لێدەردەهێنا و شتێكی لە بری دادەنا. لەم كاتەدا تەكنیكارەكە چرپەیەكی بەگوێی نەشتەرگەرەكە كرد و گوتی: مۆڵەت هەیە پرسیارێك بكەم؟

دكتۆرەكەش بە سەرسامی وەڵامی دایەوە فەرموو بپرسە

تەكنیكار گوتی: تۆ نەشتەرگەری لەسەر دڵەكان دەكەیت منیش دڵی ئوتومبێلەكان، وەك ئێوە، بەڵام بۆچی تۆ پارەیەكی یەكجار زۆر بەدەست دێنیت كەچی ئێمە قازانجمان لە ئێوە زۆر كەمترە؟!

دكتۆرەكە لە تەكنیكارەكە نزیك بوویەوە و بە هێمنی پێی گوت: ئەگەر لەتواناتدایە.......!

بزوێنەرەكە چاك بكەوە بێ ئەوەی بیكوژێنیەوە؟.

## بۆ هەموو ئەو کەسانەی بە دوای کۆچ کردندا دەگەڕێن

ناوم ئەحمەدە، عێراقیم،.........دوای ئەوەی هەڕەشەیان لەخۆم و هاوسەرەکەم کرد، هەوڵی ئەوەماندا عێراق جێبهێڵین و لە کەنەدا نیشتەجێ بین، تاوەکو بە ئارامی بژین. بەڵام بووینە نێچیری فێڵباز و.......

چیرۆکەکەمان لە عێراقدا دەست پێدەکات، کاتێك گەڕاین بەدوای کەسێك بتوانێت بانگهێشتنامە بۆ کەنەدا. پیاوێکمان ناسی بەناوی (ئەبو حەیدەر) خۆی و براکەی کەناوی (ئەبو قوسەی) لە ماڵەوە سەردانیان کردین و باسی ئەوەیان کرد کە چۆن دەرچوونمان بە فەرمی دەبێت، چونکە پیاوێك هەیە لە کەنەدا بانگهێشت نامەمان بۆ دەکات... داوای بڕە پارەیەکی زۆری کرد کە ٤ دەفتەر دۆلار بوو واتە ٤٠هەزار $...! بەڵام ئێمە ڕەتمان کردەوە و دوای گفتوو گۆیەکی زۆر لەسەر ٣ دەفتەر دۆلار واتە ٣٠ هەزار $ ڕێککەوتین بە مەرجی ئەوەی ١٥هەزار $ وەك پێشینە بدەین بە ئەبو حەیدەر....، نیوەی دووەمی پارەکەش لە کاتی گەیشتنمان بە بە فڕۆکەخانەی کەنەدا. من ترسێکم هەبوو لەوەی کە درۆمان لەگەڵدا بکەن بۆیە سوور بووم لەسەر ئەوەی لەسەر پسوولەیەك یان کومپیالەیەك ئیمزا بکەن کە ئەم پارەیەی ئێمە لای ئەوانە، سەرەتا ئەوان ڕەتیان کردەوە کە شتێکی وا بکەن بەڵام دواتر ئەبو حەیدەر بە ناچاری ئیمزای لەسەر کومپیالەکە کرد،.....ئەو بەڵێنی پێداین دوای ٤ ڕۆژ بانگهێشتنامە تۆرینتۆ لە کەنەدا...!.

بەر لە کاتی گەشتەکەمان بە هەفتەیەك قاچاخچیەکە هەواڵی پێداین کە پلانی گەشتەکەمان تۆزێك گۆڕانکاری بەسەر دا هاتوە، و کاتێکی نوێی بۆ گەشتەکەمان دانا....چونکە پلانی دەرچوونیان لە تورکیاوە ئاشکرا بوە. ڕۆژێك پێش

گەشتەکەمان، ئەبو حەیدەر هاتە مالّمان، پلیتی سەفەری پێبوو، بەلاّم بۆ کویَ؟ ترانزێت بۆ میسر پاشان سۆدان و گانا و دواتر بۆ کەناراوی فیل وئەبیدجانی پایتەخت...! دوای پشت بەستن بەخوا متمانەی خۆمان بەم قاچاخچیانە داو دەستمانکرد بە گەشتێکی زۆر ناخۆش  کە دوو رۆژی خایاند، لە کەناراوی فیل کەسێکمان بینی کە لەلایەن ئەبو حەیدەرەوە رەوانە کرابوو، ئێمەی بردە  ئوتێلێکی تا بلێی خراپ....! بەهانەشیان ئەوەبوو  رووگەیان ئاشکرا نەبێت.

دوای دوو رۆژ  چاوەڕوانی ئەبو حەیدەر هات و خانەوادەیەکی تریشی لەگەلّدا بوو لە دایك و باوك و دوو کچۆلّە پیك هاتبوون  کە تەمەنیان کەمتر بوو لە ٣ سالّ، جگە لەوان دوو گەنجی تریشی لەگەلّ بوو یەکێکیان موسولّمان نەبوو....هەموومان خەونمان بە گەیشتن بە کەنەدا دەبینی جگە لە خانەوادەکە نەبێت کە مەبەستیان هۆلّەندا بوو....لە راستیدا هەموومان بڕە پارەیەکی زۆرمان لەم گەشتە خەرج کردبوو.... .

کاتێك ئەبو حەیدەر گەیشتە لامان داوای ١٥هەزار $ ەکەی تری کرد، چونکە بە پێی قسەکانی، مەسەلەکە کۆتایی پێهاتوە و بەیانی ئێمە  گەشت دەکەین بۆ کەنەدا....!.

ئەبو حەیدەر لەگەلّ هاوڕێیەکی کە خەلّکی ئەبیدجانە  چوونە مەیخانە بۆ خواردنەوەی  مەی، شەو  سەردانیکردین و پێی راگەیاندین کە گەشتەکەمان  بۆ دوو رۆژ ی تر  دوا خراوە

لەبەر ئەوی فڕۆکە خانەی ئەبیدجان چاودێری دەکرێت....؟ لێمان پرسی: جا  ئەمە ترسی بۆ چی یە؟ کوا ئەو داوەتنامە فەرمیانەی کە بەلّێنت پێدا بووین؟ ئەویش یەکسەر پەیوەندی بە هاوڕێیەکی  ئێراقی کرد بەناوی (زیاد) کە هەلّگری

ڕەگەزنامەی یۆنانی بوو ئەم زیادە هاتوو پاسپۆرتەکانی لەهەمووومان وەرگرت و ڤیزای یۆنانی لەسەردا و گوتی: هەمووتان دەبەم بۆ یۆنان، لەوێشەوە بۆ کەنەداو ئەم خانەوادەیەش بۆ هۆڵەندا...! هەموومان ناچار بووین رازی بین چونکە هیچ برە پارەیەکمان لا نەبوو یارمەتیمان بدات بۆ گەڕانەوە بۆ بەغداد.. ئیتر ناچار بووین بۆ کوێمان ببەن لەگەڵیان بچین.

دوای هەفتەیەك لە چاوەڕوانی و هەفتەیەکی تریش لە کەناراوی فیل، ئەم بەناو (زیاد) ە پلیتی تەیارەی بۆ هێنایین بەڵام بۆ کوێ؟ ئەمجارەیان بۆ تۆگۆ؟ ئەبو حەیدەر و زیاد پێیان گوتین کە بەڕێوەبەری فرۆکەخانەی تۆگۆ هاوڕێی زیادە و پەیوەندی پێوە کردوە و بەڵێنی داوە کە رێبدات یەکسەر بچن بۆ کەنەدا بێ ئەوەی پێویست بکات بچن بۆ یۆنان و دواتر بۆ کەنەدا و هۆڵەندا.....

لەراستیدا هەموومان دڵ خۆش بووین و گوتمان: با بچین بۆ تۆگۆ....!، بەڵام کارەساتی راستەقیەمان لەو وولاتە بینی؟! جگە لە چێشتخانەیەکی لوبنانی هیچی ترمان نەبینی....نەخۆشی مەلاریا زۆر بلاّوە لە نێویان و سادە ترین خزمەتگوزاری تێدا نیە.

کە گەیشتینە تۆگۆ (زیاد) کە دواتر زانیمان ئەمە ناوە ەساختەکەیەتی پێی راگەیاندین کە تەنها دوو رۆژ لێرەین و تۆزێك دان بەخۆتان بگرن تا دەگەنە شوێنی مەبەست. ئێمەیان برد بۆ ئوتێلێکی زۆر هەرزان و خراپ بە بیانووی ئەوەی چاودێری ناکرێت، نەماندە زانی مەبەستیان ئەوەیە هیچ پارەیەکمان لێخەرج نەکەن....ئیتر دوو رۆژەکە بوو بە هەفتەیەك....هەموومان تووشی مەلاریا بووین تەنانەت دوو کچە بچکۆلانەکەش یەك هەفتە بەدەست ئەم نەخۆشیەوە نالاّندیان، ئۆقرەمان لێبڕا کێشە لەنێوان ئێمە و زیاد و ئەبو حەیدەر دروست بوو. ئەبوو

حەیدەر گوتی من ناچارم بگەڕێمەوە بەغداد چونکە کچەکەم نەشتەرگەری بۆ دەکرێت، ئێمەش زۆر بە ئاسانی باوەڕمان پێکرد ئەو گوتی ئێوە دوای دوو ڕۆژی تر لەگەڵ زیاد دەگەنە کەنەدا، ئەمە بەڵێنە لەمنەوە، ئیمەش باوەڕمان پێکرد....بەڕاستی ئەو ئەکتەرێکی زۆر بە توانا بوو......!.

ئەبو حەیدەر ئێمەی جێهێشت و هەموو پارەکەشی لەگەڵ خۆی برد کە نزیکەی ١٠ دەفتەر $ بوو واتە ١٠٠ هەزار $ دۆلار، ئێمەش لەم دوورە وولاتە بێپارە ماینەوە. من و خێزانەکەم و ئەو خانەوادەیەی کە لەگەڵمان بوون هەندێك پارچە زێڕی بچووکی وەك ملوانکە و موستیلە و بازنی دەستمان لابوو، بۆیە بە ناچاری فرۆشتمان تا خواردن و خواردنەوەمان دەست بکەوێت، هەرچی گەنجەکان بوون ئەوا پەیووەندیان بە بەغداوە کرد.....تا پارەیان بۆ رەوانە بکەن. یەك هەفتە فشارمان خستە سەر زیاد، پێمان گوت کوا هاوڕێیەکەت؟ بەڕێوەبەری فڕۆکەخانەی تۆگۆ ئەی بەڵێنی پێنەدایت یارمەتیمان بدات؟ زیاد گوتی بەداخەوە بەڕێوەبەری فڕۆکەخانە داوای لێبووردنی کردوە و ناتوانێت یارمەتیمان بدات بەڵام کارئاسانی بۆ کردووین لەڕێی بەڕێوەبەری فڕۆکەخانەی وولاتی گانای دراوسێیان کە پایتەختەکەی ئەکرایە، ئێمە بەیانی دەچین بۆ ئەو وولاتە....خۆتان ئامادە بکەن و جانتاکانتان کۆکەنەوە.....!

... بەرگەی ناخۆشی ڕێگەو برسیەتی و ماندووبوونمان گرت تا گەیشتینە ئەکرای پایتەختی گانا، ئێمە لەڕێی ووشکانیەوە گەشتمان کرد چونکە زیاد پێی گوتین پلیت نەماوە و ئەم پیاوەش بە پەلەیە و چاوەڕێمان دەکات.

زیاد هاوڕێیەکی بۆمان هێنا ناوی (علی) بوو خەڵکی باشووری لوبنان بوو، ئەو بەڵێنی دا کە دوای دوو ڕۆژ بەڕێمان بکات بۆ..........

چل ڕۆژ بەسەر بەڵێنەکە تێپەڕی و ئێمە هەر لە ئەفریقیا بووین.....! کە گەیشتینە گانا بە دزی هاتینە ژووری زیاد و زانیاری تەواومان لەسەر پاسپۆرتەکەی وەرگرت و بۆمان دەرکەوت کە ناوی ڕاستەقینەی (زایا) یە.

کاتی ڕۆیشتن هات، لەگەڵ زیاد و علی خەلیفە چووین بۆ فڕۆکەخانە، بەر لەوەی ماڵئاوایی لە زیاد بکەین پلیتەکانی لە گیرفانی دەرهێناو پێیداین، ئەمجارەیان بۆ کوێ؟ ترانزێت بۆ قاهیرە – ئیتاڵیا – یۆنان....! تووشی خورپە بووین لێمان پرسی ئەمە چیە؟ گوتی: ئەوانەی دەچن بۆ کەنەدا لە ئیتاڵیا دادەبەزن و گروپی هۆڵەنداش لە فەڕەنسا، دەبێت هەمووتان پاسپۆرتەکانتان پارچە پارچەکەن و بچنە نێو کەمپەوە،دوای دوو ڕۆژ دەگەڕێمەوە بۆ ئەوەی لەکەمپەکە بتانهێنمە دەرەوە و بەرەو کەنەدا بەڕێ بکەوین، هەرچی کۆمەڵەکەی ترە، ئەوا لەرێی هاوڕێیەکم ڕەوانەی هۆڵەندایان دەکەم.

پرسیاری ڤیزە و نیشتەجێبوونە مۆر کراوەکانمان لێکرد کە لەسەر پاسپۆرتەکانمانە ئاخۆ ساختەیە یان ڕاستەقینە؟ گوتی: وەرن لەگەڵم بۆ ئەوەی بۆتان بسەلمێنم کە ڕاستەقینەیە، هاتینە ناو فڕۆکەخانەی ئەکرا، ڤیزە و نیشتەجێبوونەکەمان لە ئامێری تایبەت بە کارە ساختەکان دا، دەرچوو شتەکان ساختە نین، بەڵکو فەرمین، هەموومان زۆر دڵخۆش بووین و گوتمان، لەکۆتاییدا دەچینە ئەوروپا، چاوەڕوانیکردن لەوێندەر زۆر باشترە لە ئەفریقیا.. ئیتر ماڵئاواییمان لە زیاد کرد و ڕوە و فڕۆکەخانەی قاهیرە بەرێکەوتین.

دوای ٨ کاتژمێر گەیشتینە قاهیرە، دڵمان زۆر خۆش بوو لە ترانزێتەکە چاوەڕوانمان دەکرد تا ئەو کاتەی ناوی گەشتەکەمان هات، بەرەو دەرگای فڕۆکەخانە بەرێکەوتین بۆ پشکنینی پاسپۆرتەکانمان، ئەفسەرەکە داوای لێکردین چاوەڕێ بین تا

نیشتەجێبوونەکانمان دەپشکنێت، ئێمەش بەخۆشیەوە پاسپۆرتەکانمان پێدا چونکە دڵنیا بووین لەوەی کە ساختە نیە....لە ناکاو ئەفسەرەکە گەڕایەوە و پێی گوتین: فەرموون لەگەڵم....؟ ئێمە هەموو سەیری یەکترمان کرد؟ چی ڕوویداوە؟ کوا علی؟ ئەفسەرەکە پێی گوتین ڤیزاکان دروستن بەڵام دزراون و هەواڵیان لەسەر دراوە....! هەموومان بەم هەواڵە تووشی شۆک بووین، ئێمە دوو خانەوادە و دوو گەنج بووین، واتە ٨ کەس....

بەشوێن عەلی دا گەڕاین بێ سوود بوو دەتگوت زەوی قووتی داوە. لە ناکاو تەلەفوونێکمان بۆ کرا لەلایەن زیادەوە، داوای لێکردین ناوی نەدەین و یەک ووشەش نەدرکێنین، پێی گوتین کە عەلی لە فڕۆکەخانەیە و بەیانی گەشتەکە دەکەین بەپێی ڕێکەوتن لەگەڵ بەڕێوەبەری فڕۆکەخانەی قاهیرە.....!.

ژن و منداڵەکان دەستیان کرد بە گریان، چونکە ئێمەیان برد بۆ تەسفیراتی ناو فڕۆکەخانەکە، ئەمەش مانای گێڕانەوەمانە بۆ ئەو شوێنەی کە لێیهاتووین.

هاوسەرەکەم داوای لە فەرمانبەرەکانی فڕۆکەخانەکە کرد مۆڵەتی پێبدەن پەیوەندی بکات بە باڵیۆزی ئێراقی، کەچی ئەوان هەرچی مۆبایل و پارە و پوول هەبوو لێیان سەندین، ئیتر بێ هۆکار ماینەوە و توانامان نەما پەیوەندی بە خانەوادەکانیشمان بکەین تا هەواڵی شوێنی تازەمانیان پێبدەین. دەستیان کرد بە سووکایەتیکردن، دەیانگوت ئێوە لای ئێمە دەمێننەوە..... ئەمجارە داوای جیاکردنەوەی هاوسەرەکانیان کرد لێمان، ئێمەش ڕەتمان کردەوە و پێمان گوتن کە کەسانێک هەن دێن بۆ دەرهێنانمان لەم شوێنە،پۆلیسەکان دوودڵ بوون لەخانەوادەکانمان، هاوسەرەکانیشمان دەستیان بە ئێمەوە گرت و هاوار و گریانیان شوێنەکەی پڕ

کردبوو، بۆیە بە ناچاری هەموومانیان لەیەك ژوور دانا بۆ خەوتن تیایدا بەلاّم چ ژوورێك! پڕ بوو لە سیسرك و شتی گەنیو..

لاوێکی فەلەّستینیمان بینی نازانم ناوی چی بوو بە نهێنی هاتە لامان بۆ ئەوەی هەوالّمان پێبدات کە ئەو دوای یەك کاتژمێری تر ئازاد دەکرێت، پرسیاری لێکردین ئەگەر شتێك هەبێت بتوانێت بۆمانی بکات، لەو کاتەدا هاوسەرەکەم ژمارەی تەلەفۆنی هاورێکەی بە سووراوی لێو نووسیەوە و دای بەم گەنجە فەلەّستینیە، پێی گوت ئەمە ژمارەی هاورێیەکمە ئێراقیە و هاوسەرەکەی بەرپرسە لە بالّیۆزخانەی ئێراقی، تکایە پەیوەندی بکە بەم ئافرەتە و پێی بلّێ کە هاورێکەت لە فرۆکەخانەی قاهیرە دەستبەسەر کراوە و داوای یارمەتی دەکات......

سوپاس بۆ خوا هەرکە ئەم گەنجە فەلەّستینیە پاکە ئازاد کرابوو یەکسەر پەیوەندی کردبوو، دوای یەك کاتژمێر بەرپرسە ئێراقیەکە گەیشتە فرۆکەخانە و کەسێکی میسریشی لەگەلّ بوو بۆ یارمەتیدانمان لە دەرچوون و بمانخەنە سەر گەشتی عەممان و دواتر بۆ بەغداد

دوای دوو رۆژ لە ناخۆشی چەشتن لە فرۆکەخانەی قاهیرە، هەموومان لە شوێنی دەست بەسەرگرتندا دەرچووین.. گەیشتینە فرۆکەخانەی عەممان، شەومان لە ترانزێت بەسەر برد.....تەواو تووشی شەکەتی و هەلاکەت بوو بووین! تەنها دەمانویست بگەرێینەوە بەغداد..

رۆژی دواتر گەیشتینەوە بەغداد، کاتێك لە دەرگای مالّەکەمانماندا، هەر هەموو تووشی سەرسوورمان بوون، چونکە ئەبو حەیدەر سەردانیکردبوون و پێی گوتبوون کە ئێمە گەیشتووینەتە کەنەدا و سلاّومان بۆیان هەیە و داوای ئەو ٣٠ وەرەقە $ ی کردبوو کە مابوو پێیبدەن چونکە بەگوتەی ئەو ئێمە لە کەنەدا پێویستمان پێی

دەبێت... بەمەش بۆمان دەرکەوت کە ئەبو حەیدەر ٣٠٠$ دۆلاری وەرگرتبوو لە خانەوادەی هەموو ئەوانەی کە لەم گەشتەدابوون.

بەم شێوەیە دوای ٤٤ رۆژ لە گەشتێکی پڕ لە ناخۆشی و نەهامەتی بەدەستی خاڵی گەڕاینەوە دوای ئەوەی تەنها ئێمە بڕی ٣٣٠٠٠$دۆلارمان زەرەر کرد...

ئەوەی دڵنەواییمان دەکات لە بڵاو کردنەوەی ئەم بابەتە ئەوەیە کە هەرکەسێك دەیەوێت لە رێگەی قاچاخچیانەوە کۆچ بکات با پەند لە ئێمە وەربگرێت و هەمان هەڵەی ئێمە دووبارە نەکاتەوە و باوەڕ بە قسەی لووس و هەڵخەڵەتێنەر و بەڵێنە درۆیینەکانی هەر کەسێك نەکەن.

# چۆن وا لەمنداڵەکانت دەکەیت نوێژ بخوێنن؟

چۆن وا لە منداڵەکانت دەکەیت لەخۆیانەوە نوێژ بخوێنن، بێ تووڕەبوون و بیر هێنانەوەیان؟

منداڵەکانت نوێژ ناخوێنن؟ یان ماندوویان کردویت بۆ ئەوەی نوێژ بخوێنن؟

وەرن سەیرکەن پشت بەخوا چۆن دەیانگۆڕن.

خوشکێك بۆی گێڕاینەوە و گوتی: با چیرۆکێکتان بۆ بگێڕمەوە کە لەگەڵ خۆم روویداوە

کچەکەم پۆلی پێنجی سەرەتایی بوو، نوێژ خوێندن بەلایەوە زۆر قورس بوو....

بەرادەیەك رۆژێکیان پێیم گوت هەستە نوێژ بخوێنە، بینیم بەرماڵەکەی گرت و بە زەوی دادا، کە گەڕایەوە لێیم پرسی نوێژت خوێند؟ گوتی بەڵێ.....

باوەڕم پێبکەن بەبێ هەستکردن، زللەیەکم لێدا، دەزانم هەڵەم کرد....بەڵام دۆخەکە تەنگی پێهەڵچنیم، گریام، لێی تووڕە بووم و لۆمەم کرد لەسەر درۆکردنەکەی و ترساندم بە سزای خوایی، کەچی ئەم قسانە هیچ سوودی نەبوو........

رۆژێکیان.....هاوڕێیەکم چیرۆکێکی بۆ گێڕامەوە کە لەگەڵ ناسراوێکیان روویدا بوو........

گوتی: سەردانی ئافرەتێکی ناسیاومانم کرد (کەسێکی سادە بوو لە رووی ئاین پەروەری)، بەڵام کە کاتی نوێژ هات منداڵەکانی تێکرا هەڵسان بۆ نوێژ خوێندن بێ ئەوەی دایکیان بانگیان بکات بۆ نوێژ خوێندن. منیش پێم گوت: چۆن منداڵەکانت لە خۆیانەوە نوێژ دەخوێنن بێ پێ گوتن یان خۆ تووڕەکردن لێیان؟

ئەویش گوتی: شتێکی وام نیە بۆتی باس بکەم تەنها ئەوە نەبێت، نزایەك هەیە بەر لە زەماوند کردنم و تا ئەمڕۆکەش هەر لەسەری بەردەوامم. باسی نزاکەی بۆ کردم،منیش دەستم کرد بە نزاکە... لە سوژدە و بەر لە دەرچوونم لە نوێژ، لە نوێژی ویتردا...

لە هەموو کاتەکانی گیرابوونی نزا ئەم نزایەم دەخوێندەوە، سوێند بە خوا... ئێستاکە کچەکەم لە قۆناغی ناوەندیە... هەر لەو کاتەی کە دەستم کرد بە نزاکە تا ئەمڕۆ، هەر ئەو بەیانیان بێدارمان دەکاتەوە بۆ نوێژی بەیانی، سوپاس بۆ خوا براکانیشی بە هەمان شێوە، مکوڕن لەسەر نوێژەکانیان

کاتێك کە دایکم سەردانیکردین وشەو لامان مایەوە، تێبینی ئەوەی کردبوو کە کچەکەم لە خەو هەڵساوە و بەسەر هەمووماندا خولایەوە تا بۆ نوێژ خوێندن ئاگادارمان بکاتەوە !.

دەزانم ئێستاکە ئێوە تامەزرۆی ئەوەن بزانن ئەم نزایە چی یە... ئەم نزایە لە (سورەتی ئیبراهیم) ە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿رَبِّ ٱجۡعَلۡنِي مُقِيمَ ٱلصَّلَوٰةِ وَمِن ذُرِّيَّتِيۚ رَبَّنَا وَتَقَبَّلۡ دُعَآءِ ٤٠﴾ (ابراهيم: ٤٠)

واتە: (((پەروەردگارا، وا لە خۆم و نەوەکانم بکە دامەزراوبین لە بەجێگەیاندنی نوێژ، پەروەردگارا ئەم نزایەم لێوەر بگرە))).

کەواتە نز، نزا، نزا کردن، نزا کردن چەکی باوەڕدارە، یەکێك لە عارفان دەڵێت: لەسەرەتای تەمەنم و لە قۆناغی خەون و ئاواتە گەورەکان، خەونم بەوە دەبینی کە ئوومەت هەمووی بگۆڕم و ئامادەنەبووم لەم رۆڵە کەمتر ببینم. کە گەورە تر بووم خەونەکەم بچووکتر بوویەوە بەوەی کە هەوڵ بدەم دۆخی وولاتەکەم بگۆڕم کە

بەچەندین ساڵ لە دواوەی وولاّتە گەشە سەندوەکانەوەیە، گەورە تر بووم بیرم لەوە کردەوە گۆڕانکاری لە شارەکەم بکەم کاتێك بووم بە سەرۆکی شارەوانی، بەلاّم لەبەدی هێنانی ئەم ئاواتەش سەر کەوتوو نەبووم. زۆرتر بە نێو تەمەندا چووم، بەدەست رەفتارە خراپەکانی دراوسێکەمان دەمنالاّند، هەوڵم دا ئەم رەفتارە بگۆڕم و کەشێکی گونجاو و لێکتێگەیشتن و گفتووگۆیەکی مرۆڤانە بێنمە کایەوە.....نەمتوانی هیچ شتێك بگۆڕم.

لە کۆتاییدا گەیشتم بەوەی کە خەونەکان گەورەن، ئەگەر لە بچووکترینیانەوە دەست پێبکەین، گەورەکەش دێتە دی.......

هەروەها منیش، ئەگەر سەرەتا لە خانەوادەکەم دەستم پێکرد و خێزانێکی نموونەییم پێکهێنابا، ئەوا دراوسێ و خەلکی گەڕەکەکە پێمان کاریگەر دەبوون، ئەگەر خەلکی گەڕەك گۆڕان، ئەوا بەرە بەرە دۆخی وولاّتەکەم دەگۆڕێت، ئەگەر گۆڕانکاری بەسەر وولاّتەکەم داهات، ئەوا گۆڕانێکی زۆر بەسەر واقیعی ئوممەتەکەم دادێت.

# شکست ڕێگەیەکە بۆ سەرکەوتن

ئەحمەد دەستی کرد بە گریان، بێئومێدی کۆتی کرد و پەردەی خەم دایگرت چونکە نەیتوانی وەك هاوڕێکانی ئەو نمرەیە بێنێت کە بیگەیەنێتە یەکێك لە کۆلێژەکان، ئەو دواکەوت لەوان، ئاخر چەندین ساڵە هاوڕێی خوێندنن و لەگەڵ یەکتری ژیانێکیان بەسەر بردوە. ئێستاکە ئەو تەنها دوو ڕێگای لەپێشە:

**یەکەمیان:** خۆی بداتە دەست خەم و پەژارە و داڕووخانی دەروونی و هەست کردن بە گوناه و نشوستی، بەمەش ڕێگایەك نادۆزێتەوە بۆ دەرچوون لە مەینەتیەکەی.

**دووەمیان:** ئەوەی دووچاری بوە لەسەر خۆی رابماڵێت و سەیری داهاتوو بکات.

ئەو کاتەی کە ئەحمەد پێویستە قەرەبووی بکاتەوە کەم نیە، بەڵکو ۳ ساڵی خوێندنە، لەسەرەتا ڕێگای یەکەمی هەڵبژارد، وا مامەڵەی لەگەڵ نشوستیەکەی کرد کە ئەمە قەدەرێکە و لێترازانی نیە، بۆیە کارەکە قورس بوو لەسەری، بۆشایی نێوان خۆی و هاوڕێکانی فراوانتر بوو.

رووگەی خۆی گۆڕی، سوودی بینی لە نشووستەکەی، پێکەنی و گرفتەکەی بە هێمنی چارەسەر کرد، دوای ئەوی گرفتەکانی بەش بەش کرد،خشتەیەکی بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانی دانا، یەکەم سەرکەوتن و پێشوەچوونی بەخۆیەوە بینی، هەندێك کاتی گێڕایەوە، گەرم و گوڕ تر بوو، ڕەنگی دەرچوونەکەی درەوشاوە تر بوو، تا وای لێهات چێژ لە چارەسەرکردنی کێشەکانی وەرگرێت و خۆشی دەبینی لە سەراو ژێرکردنی شکست بۆ سەرکەوتن، لە خوێندندا زۆر پێشکەوت، بگرە تێکڕای دەرچوونی زۆر زیاتر بوو لە هاوڕێکانی لەهەمان وانەکان.

ئەحمەد بە نمرەیەکی زۆر بەرز لە زانکۆ دەرچوو، بۆیە ئەندامانی دەستەی فێرکردنی زانکۆ هەڵیان بژارد ببێتە وانە بێژ لە کۆلێژ، ئەمەش بوە گەورە ترین هەنگاو بۆ ئەحمەد چونکە بەم سەرکەوتنەی ئەوی لەدەستی دابوو بەدەستی هێنایەوە و پێش هاورێکانیشی کەوت و خوێندنی باڵاشی تەواو کرد و ئێستاکە وانە بێژە لە زانکۆ.
ئەحمەد سوپاسی شکستەکەی خۆی کرد چونکە بوە هاندەرێك و فاکتەرێکی بەهێزی سەرکەوتنەکانی.

# ئەبراهام لینکۆڵن (ئازادکەری بەندەکان)

ژیانێکی پڕ لە شکست، زنجیرەیەك وێستگە لە نشوستی یەك لە دوای یەك،لە ژیانی ئەم پیاوە بەدی دەکەیت، بەلاّم ملی دانەنواد بۆ ئەم شکستیانە.

با گەشتێك بەنێو شکستەکانی ئەم پیاوە بکەین تا دەگاتە سەرکەوتنە راستەقینەکەی، ئەو راستەقینەیەی کە وای لێکردین لێرەدا ناوی بێنین.

لە تەمەنی ٢٤ دەستی بە بازرگانیکردن کرد، بەلاّم سەرنەکەوت، جارێکی تر دەستی کردەوە بە بازرگانی کەچی دیسان سەرنەکەوت. لە تەمەنی ٣١ ساڵی هەموو سامانەکەی لە بازرگانیکردن لەدەستدا، ئەم شەپۆلانەی سەرنەکەوتن چۆکی پێدانەدا بەلکو لەتەمەنی ٣٤ ساڵی جارێکی تر هاتەوە نێو جیهانی بازرگانی، جارێکی تر لە تەمەنی ٣٦ ساڵی زیانی گەورەی پێکەوت و تووشی داڕووخانی دەروونی بوو. ئەمجارەیان رووی لە سیاسەت کرد و وازی لە بازرگانی هێنا، لە تەمەنی ٣٨ ساڵیدا نەیتوانی لە هەڵبژاردنەکانی کۆنگرێس سەرکەوێت. لەتەمەنی ٤٠ ساڵی جارێکی تر هەوڵی دا بچێتە کۆنگرێس بەلاّم دووبارە سەرکەوتوو نەبوو.بۆ جاری سێیەم و چوارەم لە تەمەنی ٤٢ و ٤٦ ساڵیدا بە هەمان شێوە نەیتوانی سەرکەوێت بۆ کۆنگریسی ئەمریکی. ئەم پیاوە وازی نەهێناو لەتەمەنی ٤٨ ساڵیدا بۆ جاری پێنجەم خۆی پالاّوت کەچی دیسان سەرنەکەوت. ئەمجارەیان لەتەمەنی ٥٠ ساڵی هەولیدا ببێت بە جێگری سەرۆك کۆمار بەلاّم سەرنەکەوت. لە تەمەنی ٥٢ ساڵی بوو بە سەرۆکی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا.

برای خوێنەرم... سەیری ئەو زنجیرە شکستانە بکە کە ئەم پیاوە تووشی هات و چۆن کۆتاییانی پێهێنا بە سەرکەوتنێکی مەزن کە سەرۆکایەتیکردنی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا بوو.

## هاوڕێ کێ یە؟

سەربازەکە بە سەرۆکەکەی گوت: گەورەم هاوڕێکەم لە گۆڕەپانی جەنگا نەگەڕاوەتەوە....مۆڵەتم بدە بچم بە دوایدا بگەڕێم...

سەرۆك: مۆڵەت نیە، نامەوێت خۆت بخەیە مەترسیەوە لە پێناو پیاوێك کە ئەگەری مردنی زیاترە لە ژیانی.

سەربازەکە گرنگی بە قسەکانی سەرۆکەکەی نەدا......و بەدوای هاوڕێکەیدا چوو!.

دوای کاتژمێرێك گەڕایەوە، بەڵام بە برینێکی سەختی کوشندە و لاشەی هاوڕێکەشی بە کۆڵەوە بوو........

سەرۆکەکە بە لەخۆباییەوە پێی گوت: پێم نەگوتی ئەو مردوە... ئایا ئەم کارە ئەوەندەی دەهێنا خۆت بخەیە ئەم هەموو مەترسیە بۆ گەڕان بەدوای لاشەکەی؟

سەربازەکە لەسەرەمەرگدا بوو و گوتی: بەدڵنیاییەوە بەڵێ گەورەم....کە دۆزیمەوە هێشتا زیندوو بوو، و پێی گوتم (دڵنیا بووم لەوەی کە تۆ دێیت).

# چیرۆکی بەلەمە سەیرەکە

یەکێك لە بێباوەڕان _ باوەڕی بە خوا نیە – لە یەکێك لە وولاتانی موسوڵمانان گرەوی بەرامبەر یەکێك لە زانا گەورەکانی موسوڵمانانی کرد لەسەر بوونی خودا و بۆ ئەم مەبەستەش کاتێك و شوێنێکیان دیاریکرد.

بێ باوەڕەکە لە کات و شوێنی دیاریکراودا ئامادە بوو.......خەڵکێکی یەکجار زۆریش لە هەمان شوێن ئامادە بوون بۆ زانینی ئەنجامی ئەم گرەوە، بەڵام زاناکە دوا کەوت.

ماوەیەکی باش چاوەڕوانی زاناکەیان کرد بەڵام ئەو نەهات، لێرەدا بێباوەڕەکە بە پێکەنینەوە و بە متمانە بەخۆ بوونێکی زۆرەوە رووی لە خەڵکەکە کرد و گوتی:

زاناکەتان ترسا و نەهات چونکە دەیزانی من گرەوەکە دەبەمەوە و سەردەکەوم، و بۆتان دەسەلمێنم کە ئەم بوونەوەرە، خاوەنێکی نیە بە ناوی خودا....خوا هەر بوونی نیە ؟!.

لەو کاتەی کە ئەم بێباوەڕە ئەم قسانەی دەکرد، زانا موسوڵمانەکە گەیشت، سڵاوی کرد و داوای لێبوردنی کرد لەسەر دوا کەوتنەکەی و گوتی:

کاتێك گەیشتمە سەر لێواری رووبارەکە بۆ ئەوەی بۆ ئێرە بێم، بەلەمێك نەبوو بمپەڕێنێتەوە بۆ ئێرە، بۆیە ناچار بووم چاوەڕوانی بەلەمێك بکەم.

پاش دەمێك چاوەڕوانی، بینیم کۆمەڵە دارێك لە ناو رووبارەکە پەیدا بوون و لە تەنیشت یەکتر ریز بوون و بەخێرایی و بەرێك و پێکی لە تەك یەك ریز بوون تا

بەلەمێکیان دروست کرد، پاشان هات لەبەردەمم وەستا، منیش سواری بەلەمەکە بووم و بەرەو ئێرە هاتم !.

پێباوەڕەکە بە پێکەنینەوە هاواری کردوو گوتی: ئەم پیاوە شێتە خەڵکینە، چۆن دار لەخۆڕیەوە کۆ دەبێتەوە و دەبێت بە بەلەم بێنەوەی کەس دروستی بکات و چۆن جووڵەی کرد بێنەوەی کەشتیەوانێك بیجووڵێنێت؟

زاناکەش پێکەنی و گوتی: ئەی چی بەخۆت دەڵێی، تۆ باوەڕ ناکەیت بەلەمێك لەخۆڕیەوە دروست بێت، ئەی چۆن دەڵێی کە ئەم بوونەوەرە گەورەیە خاوەنێکی نیە دروستی کردبێت!؟.

# چیرۆکی یەک درهەمەکە

دەگێڕنەوە ژنێك هاتە لای یەكێك لە زاناكان، و پێی گوت: براكەم فەوتی كرد و لەدوای خۆی ٦٠٠ درهەمی جێهێشت،ماڵەكەیان دابەش كرد و تەنها درهەمێكیان بەمن دا! زاناكەش تۆزێك بیری كردەوە و گوتی: پێدەچێت برایەكەت هاوسەرێك و دایكی و دوو كچ و دوانزە برای هەبێت.

ئەم ئافرەتە سەری سوڕما لە زیرەكی ئەم زانایە و گوتی: بەڵێ راست دەكەی

زاناكە گوتی: ئەم درهەمە مافی خۆتە و ستەمیان لێنەكردویت، دابەشەكەش بەم شێوەیەیە: هاوسەرەكەی هەشت یەكی بەر دەكەوێت كە بڕەكەی (٧٥) درهەمە، دوو كچەكەشی دوولەسەر سێیان بەر دەكەوێت كە بڕەكەی (٤٠٠) درهەمە، دایكەكەشی شەش یەكی بەردەكەوێت كە دەكاتە (١٠٠) درهەم، لەم پارەیە (٢٥) درهەم دەمێنێتەوە و بەسەر هەر ١٢ براو خوشكەكەی دا دابەشدەبێت، هەر برایەك دوو ئەوەندەی خوشكەكەی بەردەكەوێت واتە (٢) درهەم، بەهەموویان دەكاتە (٢٤) درهەم، ئەوەی دەمێنێتەوە كە (١) درهەمە ئەویش مافی تۆیە.

# چیرۆکی پارە وون بومکە

دەگێڕنەوە شەوێکیان  پیاوێك هاتە لای پێشەوا ئەبو حەنیفە و پێی گوت: ئەی پێشەوا، ماوەیەکی زۆر پێش ئێستا  برێك پارەم لە شوێنێکدا شاردوەتەوە و ئێستاکە شوێنەکە نادۆزمەوە، یارمەتیم دەدەی لە دۆزینەوی شوێنەکەی؟

پێشەوا پێی گوت: ئەمە کاری فیقهناس نیە تا چارەیەکت بۆ بدۆزمەوە. پێشەوا ئەبو حەنیفە کەمێك بیری کردەوە، و پێی گوت: برۆ تا نوێژی بەیانی نوێژ بخوێنە پشت بە خوا پارەکەت دەدۆزیەوە.

پیاوەکە پێشەوا ئەبو حەنیفەی جێهێشت و دەستی کرد بە نوێژ خوێندن....

لەو کاتەی کە لە نوێژدا بوو، شوێنی شاردنەوەی پارەکەی هاتەوە  یاد، خێرا نوێژەکەی تەواو کرد و چوو بۆ شوێنی مەبەست! کە شوێنەکەی پشکنی بینی پارەکە لەهەمان شوێنە، ئیتر بە خۆشیەوە پارەکەی هەلگرت  و گەڕایەوە ماڵ.

بۆ رۆژی دواتر، پیاوەکە خێرا چوە لای پێشەوا ئەبو حەنیفە و سوپاسی کرد لەسەر دۆزینەوەی پارەکەی و لێی پرسی: چۆن زانیت من لەکاتی نوێژدا شوێنی پارەکە دەدۆزمەوە؟

پێشەوا گوتی: لەبەر ئەوەی دەمزانی شەیتان ناهێڵێت نوێژەکەت بە رێکی بکەیت، بەڵکو سەرقاڵت دەکات بە  بیرکردنەوە لە شوێنی پارەکە  تا دەیدۆزیەوە.

# چیرۆکی ژنە داناکە

ڕۆژێکیان پێشەوا عومەر (ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لەسەربێت) چوە سەردوانگە و ووتارێکی پێشکەش بە خەڵك کرد. لە ووتارەکەیدا داوای لە خەڵك کرد زیادە ڕۆیی نەکەن لە مارەیی کچەکانیان، چونکە پێغەمبەری خوا و یاران لە ٤٠٠ درهەم زیاتریان وەرنەگرتوە. بۆیە فەرمانی پێکردن کە پێشینەی ئافرەتەکان زیاتر نەبێت لە ٤٠٠ درهەم و لە دوانگەکەی هاتە خوارەوە. ئافرەتێکی قورەیشی هاتە لای پێشەوا عومەر و پێی گوت: ئەی پێشەوای موسوڵمانان، تۆ نەهیت لە خەڵك کرد پێشینەی ئافرەتەکانیان زیاتر بێت لە ٤٠٠ درهەم؟ گوتی بەڵێ. ژنەکە گوتی: ئەی گوێت لێنەبوە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِنْ أَرَدتُّمُ ٱسْتِبْدَالَ زَوْجٍ مَّكَانَ زَوْجٍ وَءَاتَيْتُمْ إِحْدَىٰهُنَّ قِنطَارًا فَلَا تَأْخُذُوا۟ مِنْهُ شَيْـًٔا ۚ أَتَأْخُذُونَهُۥ بُهْتَـٰنًا وَإِثْمًا مُّبِينًا ۝٢٠﴾ (النساء: ٢٠).

(قنگار: واتە پارەی زۆر)؟ پێشەوا عومەر گوتی بەخشندەییت خوایەگیان، هەموو خەڵك لە عومەر شارەزا ترن، خێرا رووی کردە دوانگەکەی و گوتی: ئەی خەڵکینە من کەمێك پێش ئێستا داوام لێکردن زیادە ڕۆیی نەکەن لە وەرگرتنی مارەیی و پێشینەی ئافرەتەکانتان، ئێستاکە پێتان دەڵێم ئێوە ئازادن لە پێدانی پێشینەی ئافرەتەکان هەرکەسێك لە ئێوە چۆن و چەند پارەی پێشینە دەدات ئەو ئازادە با بە ئارەزووی خۆی بکات.

# چیرۆکی خەلیفەی دانا

عومەری کوڕی عەبدولعەزیز لە نێو خەڵکدا بە لە دانایی و نەرم و نیانی ناو بانگی دەرکردبوو. ڕۆژێکیان یەکێک لە کوڕەکانی مۆڵەتی هاتنە ژوورەوەی لێوەرگرت و پێی گوت: باوکە گیان! بۆ لە هەندێک مەسەلەدا نەرمی دەنوێنێت؟ سوێند بەخوا گەر من لە شوێنی تۆ دابم بەهیچ شێوەیەک ناترسم لە بڕیاردان لەسەر شتی ڕەوادا.

خەلیفە عومەر وەڵامی دایەوە و گوتی: پەلە مەکە کوڕەکەم، خوای گەورە دوو جار لەقورئاندا زەمی مەی کردوە ئینجا لە جاری سێیەمدا قەدەغە و حەرامی کرد لەسەر موسوڵمانانداا، منیش لەوە دەترسم ئەگەر بەیەکجاری هەرچی شتە خراپەکانە هەر هەمووی بەیەکجاری قەدەغەی بکەم لە خەڵکەکە، بەرگەی نەگرن و بەرامبەر بڕیارەکانم بوەستن و بەمەش فیتنە و ئاشوبێکی گەورە روو دەدات.

کاتێک کوڕەکە ئەمەی بیست زانی باوکی کە بێدەنگی دەکات لەسەر شتەکان لە لاوازی نیە بەڵکو ئەمە لە دانایی و باش حاڵی بوونیەتی لە ئایینەکەی خۆی.

## چیرۆکی گەلای توت

ڕۆژێکیان هەندێك کەس هاتنە لای پێشەوا شافیعی و داوای بەڵگەیەکیان لێکرد لەسەر بوونی خوای گەورە. ئەویش نەختێك بیری کردەوە و پێی گوتن: بەڵگەم گەڵای (توت) ە ئەوانیش بە سەر سوورڕمانەوە گوتیان: چۆن ئەم گەڵایە دەکەی بە بەلگە؟ لەوەلاّمدا شافیعی گوتی: گەڵای (توت) یەك جۆرە تامی هەیە، ئەگەر کرمی ئاوریشم خواردی ئەوا ئاوریشمی لێبەرهەم دێنێت، ئەگەر مێشیش خواردی ئەوا هەنگوینی لێبەرهەم دێنێت، ئەگەر ئاسکیش خواردی ئەوا بۆنی میسکی لێبەرهەم دێنێت.....دەباشە کێ بنەچەکەی یەك خستوە و دەرچەکانیش جیا؟

ئەمە تەنها خوای خولقێنەر و بەدیهێنەری ئەم بوونەوەرە یە.

# چیرۆکی ئەو کەسەی پژمی و بیری چوو

عەبدوڵڵای کوڕی موبارەك عابیدێکی فیقهناس بوو، شارەزا لە قورئان و فەرموودە، خەڵکێکی یەکجار زۆر لە کۆڕ و وانەکانی دادەنیشتن تا لە زانستە زۆرەکەی شتێك فێر ببن. ڕۆژێکیان لەگەڵ پیاوێکدا بە ڕێگادا دەڕۆیشتن، لە ناکاو پیاوەکە پژمی، بەڵام سوپاسگوزاری خوای نەکرد، کوڕی موبارەکیش سەیرێکی کرد تا ئاگاداری بکاتەوە لەوەی کە سوپاسگوزاریت نەکرد....
(کە ئەمە سوننەتێکە پێویستە هەموو موسوڵمانێك پارێزگاری لێبکات)، بەڵام ئەم پیاوە هەستی پێنەکرد. کوڕی موبارەك ویستی ئەم سوننەتەی فێر بکات بێ ئەوەی بەگیری بێنێت، بۆیە لێی پرسی: ئەگەر یەکێك پژمی، دوای پژمینەکەی چی دەڵێت؟ پیاوەکە گوتی: دەڵێت الحمد لله (واتە سوپاس بۆ خوا).
لەو کاتەدا کوڕی موبارەك پێی گوت: خوای گەورە ڕێنموونیت بکات و دەروونت ئاسوودە بێت (یهدیکم الله ویصلح بالکم).

## چیرۆکی پیاوه مشتو مڕ کارەکە

جارێکیان پیاوێکی مشتومڕکار هاتە لای پێشەوا شافیعی و لێی پرسی: دەکرێت پێم بڵێیت، ئەگەر ئیبلیس لە ئاگر دروستکرابێت خوای گەورە چۆن بە ئاگر سزای دەدات؟

پێشەوا شافیعی نەختێك بیری کردەوە، پاشان تۆپەڵە قوڕێکی ووشکی هێناو گرتیە پیاوەکە. نیشانەکانی ئێش و ئازار و تووڕەیی لەسەر روخساری پیاوەکە دەرکەوت، لەوکاتەدا شافیعی پێیگوت: ئازارم پێگەیاندی؟

پیاوەکە گوتی: بەڵێ

شافیعی گوتی: چۆن دەبێت تۆ لە قوڕ دروستکراوی و قوڕیش ئازارت پێبگەیەنێت؟

پیاوەکە لە مەبەستەکەی شافیعی گەیشت بۆیە وەڵامی نەدایەوە و تێگەیشت چۆن خودا شەیتانی لە ئاگر دروست کردوە و بە ئاگریش سزای دەدات.

## چیرۆکی گومان کارەکە

یەکێك لە گومان دروستکارەکان لە مەجلیسی ئیبن عەقیلی فیقهناس دانیشت.

دوای ماوەیەك پرسیاری لە ئیبن عەقیل کرد و گوتی: من چەند جارێك خۆم دەشۆرم، لەگەڵ ئەوەش گومان دەبەم ئاخۆ پاك بوومەتەوە یان نا، ئایا رای جەنابتان لەم بارەوە چی یە؟

ئیبن عەقیل وەڵامی دایەوە و گوتی: هەستە برۆ تۆ نوێژت لەسەر نیە!

پیاوەکە: چۆن؟

ئیبن عەقیل: لەبەر ئەوەی پێغەمبەری خوای صەلات و سەلامی خوای لەسەر بێت فەرموویەتی (قەڵەم لەسەر سێ کەس هەڵگیراوە: شێت تا بەهۆش خۆی دێتەوە، خەوتوو تا خەبەری دەبێتەوە، منداڵ تا بالغ دەبێت).

ئەوەی چەند جار خۆی دەکات بەئاودا — وەك تۆ — و هەرگومانی ئەوەی هەیە کە پاك نەبۆتەوە، ئەوە بێگومان شێتە....

# چیرۆکی تاعوون

پێشەوای موسوڵمانان عومەری کوڕی خەتتاب بە گەشتێك دەرچوو بۆ وولاتی شام، لەم گەشتەیدا هەندێك لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوای لەگەڵدا بوو. لە رێگەدا بیستی کە نەخۆشی تاعوون لە وولاتی شامدا بلاو بۆتەوە و خەلکێکی زۆری کوشتوە، بڕیاری دا بگەڕێتەوە و رێگەی نەدا هیچ کامێك لەوانەی کە لەگەشتەکەدان بچێتە ئەم ناوچانە.

ئەبوعوبەیدەی کوڕی جەڕڕاحی گەورە هاوەڵ پێی گوت: لەقەدەری خوا رادەکەیت ئەی پێشەوای موسوڵمانان؟ پێشەوای عومەر فەرمووی: خۆزگە یەکێکی تر ئەم قسەی بکردایە باوکی عوبەیدە! بەڵێ رادەکەین لەو قەدەرەی خوا بۆ قەدەرێکی تری خودا: ئەگەر کۆمەڵە ووشترێکت هەبێت و دۆڵێکی فراوانت کەوتە بەرچاو، لایەکی بەپیت و لایەکەی تریشی ووشك و بێ گژوو گیا ئایا ئەگەر لە لەوڕگە بە پیتەکە ووشترەکانت لەوەڕاند ئەمە لە نێو قەدەری خوادا نیە؟ وە ئەگەر ووشترەکانت بردە نێو لەوڕگا ووشکە بێ گژووگیاکە ئەویش هەر لە نێو قەدەری خوا نیە؟

## چیرۆکی خەلیفە و قازی

یەکێك لە خەلیفەکان داوای لە پیاوەکانی کرد ئیاسی کوڕی موعاویەی فیقهناسی بۆ بێنن.

کە ئیاسیان بۆ هێنا، خەلیفە پێی گوت: داوات لێدەکەم پایەی قازیەتی بگریە ئەستۆ، بەڵام ئیاس رەتی کردەوە ئەم پایەیە وەربگرێت و گوتی: من بۆ ئەم کارە ناشێم!

ئەم وەڵامەی ئیاس کتوپڕ بوو بۆ خەلیفە، بۆیە بە توورەییەوە پێی گوت: تۆ راست ناکەیت! ئیاسیش یەکسەر وەڵامی دایەوە و پێی گوت: ئێستاکە تۆ حوکم و بڕیارت دا لەسەرم. خەلیفە گوتی چۆن؟

ئیاس گوتی: لەبەر ئەوەی ئەگەر درۆزن بم – وەك تۆ دەڵێیت – ئەوا بۆ قەزاوەت ناشێم، وە ئەگەر راستگۆش بم ئەوا پێم گوتی من بۆ قەزاوەت ناشێم.

# چیرۆکی حوکمی بێتاوانی

ئافرەتێك شووی کرد، دوای شەش مانگ منداڵێکی بوو، ئەوی باوە لە ناو خەڵك کە زۆربەی ئافرەتان لە ٩ مانگی یان ٧ مانگی منداڵیان دەبێت.

خەڵك گومانیان بەم ژنە برد کە دلسۆز نەبووبێت بۆ پیاوەکەی، و لە کەسێکی تر ئەم منداڵەی بوە، بۆیە بردیانە لای خەلیفە بۆ سزادانی. خەلیفەی ئەو کاتەش عوسمانی کوڕی عەففان بوو خودا لێی رازی بێت.

کاتێك ئافرەتەکەیان هێنا پێشەوا عەلی خودا لێی رازی بێت لە خزمەت پێشەوای ئیمانداران دانیشتبوو و گوێی لە کێشەکە بوو. پێشەوا عەلی پێیگوتن: بۆتان نیە ئەم ئافرەتە سزا بدەن! هەموو ئامادە بوان سەریان سوڕما لە قسەکەی پێشەوا عەلی و گوتیان چۆن؟

پێشەوا عەلی گوتی: خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَوَصَّيۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيۡهِ إِحۡسَٰنًاۖ حَمَلَتۡهُ أُمُّهُۥ كُرۡهٗا وَوَضَعَتۡهُ كُرۡهٗاۖ وَحَمۡلُهُۥ وَفِصَٰلُهُۥ ثَلَٰثُونَ شَهۡرًاۚ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ أَشُدَّهُۥ وَبَلَغَ أَرۡبَعِينَ سَنَةٗ قَالَ رَبِّ أَوۡزِعۡنِيٓ أَنۡ أَشۡكُرَ نِعۡمَتَكَ ٱلَّتِيٓ أَنۡعَمۡتَ عَلَيَّ وَعَلَىٰ وَٰلِدَيَّ وَأَنۡ أَعۡمَلَ صَٰلِحٗا تَرۡضَىٰهُ وَأَصۡلِحۡ لِي فِي ذُرِّيَّتِيٓۖ إِنِّي تُبۡتُ إِلَيۡكَ وَإِنِّي مِنَ ٱلۡمُسۡلِمِينَ ﴿١٥﴾﴾ (الأحقاف: ١٥)

واتە (ماوەی دوو گیانی و شیردان بە منداڵ سی مانگە)

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَٱلۡوَٰلِدَٰتُ يُرۡضِعۡنَ أَوۡلَٰدَهُنَّ حَوۡلَيۡنِ كَامِلَيۡنِۖ لِمَنۡ أَرَادَ أَن يُتِمَّ ٱلرَّضَاعَةَۚ وَعَلَى ٱلۡمَوۡلُودِ لَهُۥ رِزۡقُهُنَّ وَكِسۡوَتُهُنَّ بِٱلۡمَعۡرُوفِۚ لَا تُكَلَّفُ نَفۡسٌ إِلَّا وُسۡعَهَاۚ لَا تُضَآرَّ وَٰلِدَةُۢ بِوَلَدِهَا وَلَا مَوۡلُودٞ لَّهُۥ بِوَلَدِهِۦۚ

وَعَلَى ٱلْوَارِثِ مِثْلُ ذَٰلِكَ ۗ فَإِنْ أَرَادَا فِصَالًا عَن تَرَاضٍ مِّنْهُمَا وَتَشَاوُرٍ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا ۗ وَإِنْ أَرَدتُّمْ أَن تَسْتَرْضِعُوٓا۟ أَوْلَٰدَكُمْ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِذَا سَلَّمْتُم مَّآ ءَاتَيْتُم بِٱلْمَعْرُوفِ ۗ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٢٣٣﴾ ( البقرة: ٢٣٣)

واتە: دایکان دەتوانن بۆ دوو ساڵ شیر بدەن بە کۆرپەکانیان، کەواتەشیردانەکە ٢٤ مانگە و دووگیانیش دەکرێت شەش مانگ بێت.

# چیرۆکی ژنەکە و فیقهناسەکە

ئافرەتێك بیستی کە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود نەفرەتی لەو ژنانە کردوە کە شێوەی خۆیان دەگۆڕن، وەك جیا کردنەوەی نێوان ددانەکان یان باریك کردنی برۆکان، بۆیە بڕیاریدا بچێتە لای ئەم هاوەڵە و خۆی پرسیاری لێبکات.
کاتێك ژنەکە پرسیارەکانی کرد، ئەویش پێی گوت: بۆ نەفرەت لە کەسانێك نەکەم کە پێغەمبەری خوا نەفرەتی لێکردوون و لە قورئانیشدا ئاماژەی بۆ کراوە !. ژنەکە گوتی: بەڵام من لە هەموو قورئاندا گەڕام شتێکی وام نەدۆزیەوە ئاماژە بەوە بکات کە نەفرەت لەو ئافرەتانە بکرێت کە بەم کارانە هەڵدەستن!
لێرەدا دانایی ئەم فیقهناسە دەردەکەوێت کە چۆن شارەزای ئایینەکەی خۆیەتی و پێی گوت: ئایا ئەم ئایەتەت نەخوێندۆتەوە کە دەفەرموێت:
﴿ مَّآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ مِنْ أَهْلِ ٱلْقُرَىٰ فَلِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَـٰمَىٰ وَٱلْمَسَـٰكِينِ وَٱبْنِ ٱلسَّبِيلِ كَىْ لَا يَكُونَ دُولَةًۢ بَيْنَ ٱلْأَغْنِيَآءِ مِنكُمْ ۚ وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُوا۟ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ۝٧ ﴾
(الحشر: ٧) واتە: (ئەوەی پێغەمبەری خوا فەرمانی پێکردن بیکەن و ئەوی کە نەهی لێکردن وازی لێبێنن). ژنەکە گوتی: بەڵێ خوێندوومەتەوە. عەبدوڵڵا گوتی: ئەوتانی قورئانیش نەهی لێکردوە.

# چیرۆکی حەلاڵ و حەرام

یەکێك پرسیاری لە عبداللە ی کوڕی عەبباس کرد: رات چی یە دەربارەی گۆرانی؟ ئایا حەلاڵە یان حەرام؟

عبداللە گوتی: بە شتێك دەڵێم حەرام کە لە قورئاندا حەرام کرابێت.

پیاوەکە گوتی: ئایا حەلاڵە؟

عبداللە گوتی: بە شتێك دەڵێم حەلاڵ کە لە قورئاندا حەلاڵ کرابێت. پاشان سەیری پیاوەکەی کرد رامابوو، بۆیە پێی گوت: ئەگەر حەق و بەتاڵ لە رۆژی قیامەتا هاتن ئایا گۆرانی بەلای کامیانەوەدا دەکەوێت؟

پیاوەکە گوتی: لەگەڵ بەتاڵ؟

عبداللە گوتی: تەواو.......ئەوەتا خۆت فەتوات بۆ خۆت دا.

# چیرۆکی پرسیارە قورسەکە

پیاوێکی بەساڵاچوو هاتە کۆڕی شافیعی و دانیشت. پاشان پرسیاری لێکرد: بەڵگە و نیشانە چی یە لە ئایینی خوادا؟

شافیعی: کتێبی خوا، قورئان.

پیاوە پیرەکە: چیتریش؟

شافیعی: سوننەتی پێغەمبەری خوا

پیاوە پیرەکە: چیتریش؟

شافیعی: رێککەوتنی ئوممەت.

پیاوە پیرەکە: بەچ بەڵگەیەکەوە دەڵێیت رێککەوتنی ئوممەت؟

لێرەدا شافیعی بێدەنگ بوو و نەیتوانی وەڵامی بداتەوە!

پیاوە پیرەکە گوتی: سێ رۆژت مۆڵەت پێدەدەم بۆ وەڵامی پرسیارەکەم.

شافیعی چوەماڵەوە و بەردەوام بوو لە خوێندنەوە و گەڕان. دوای سێ رۆژ پیاوە بەساڵاچوەکە گەڕایەوە کۆڕی شافیعی و سڵاوی کرد و دانیشت.

شافیعی گوتی: لەهەر شەو و رۆژێکدا هەموو قورئانم ٣ جار خوێندۆتەوە تا خوای گەورە رێنموونی کردم بۆ ئەو ئایەتەی کە دەفەرموێت: ﴿ وَمَن يُشَاقِقِ ٱلرَّسُولَ مِنۢ بَعۡدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُ ٱلۡهُدَىٰ وَيَتَّبِعۡ غَيۡرَ سَبِيلِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ نُوَلِّهِۦ مَا تَوَلَّىٰ وَنُصۡلِهِۦ جَهَنَّمَۖ وَسَآءَتۡ مَصِيرًا ﴾ (النساء: ١١٥)

واتە: (هەرکەسێك دژایەتی سوننەت و بەرنامەی پێغەمبەر بکات، دوای ئەوی کە رێبازی هیدایەت و دیدنداری بۆ روون بۆوە و شوێنی رێچکەو رێبازی تر بکەوێت،

نەك رێبازی ئیمانداران، ئەوا وێڵی دەکەین بۆ ئەو رێچکە و رێبازەی کە خۆی هەڵی بژاردوە، پاشان لە دۆزەخی توند دەکەین و تێیدا دەیبرژێنین، بێ گومان ئەوە سەرەنجامێکی زۆر ناخۆش و سامناکە)

# چیرۆکی سەرکەوتنی ژاپۆن

ژیان پڕیەتی لە پەند و عیبرەت، هەندێك جار لە کەسەکان و هەندێك جار لە گەلان و هەندێك جاریش لە ژیار و شارستانیەتەکان وەردەگیرێت. بەڵام لەهەمووی گەورە تر ئەوەیە تۆ پەند لە هەرموویان وەربگریت تاوەکو خۆت و کۆمەڵگەت و ژیارەکەت بەیەکەوە بەرە و لووتکە بڕۆن و ئەم رابوونە وا دەکات لە لووتکە بمێنیەوە و ببیت بە پێشەنگی گەلان. ئەم چیرۆکەمان باس لەسەرکەوتنی وولاتێك دەکات کە پێی دەڵێن ژاپۆن یاخود نیپۆن وەك بەزمانی خۆیان ناوی دەبەن و مانای (وولاتی رۆژی پڕشنگدار) دەگەیەنێت. با بچینە نێو ناوەڕۆکی چیرۆکەکە.......

وولاتی ژاپۆن شان بە شانی گەلانی عەرەبی چەندین شاندی خوێندنی رەوانەی ئەڵمانیا کرد بەمەبەستی وەرگرتنی زانست و زانیاری و لێهاتوویی. هەر دوولا بەمەبەستی دروست کردن و ئامادە کردنی ژیارێکی بەهێز بوون بۆ گەلەکانیان تا کێبرکێی گەلانی پێبکەن لە بوارە جیاجیاکاندا! ژاپۆنیەکان کە گەڕانەوە ئامادەی تەواویان هەبوو بۆ ئەم مەبەستە کەچی عەرەبەکان بە دەستی خاڵیەوە گەڕانەوە نێو باوەشی خاك و کۆمەڵگەیان! دەبێت نهێنیەکە چی بێت و چۆن وا رووی دابێت؟ با بچینە نێو ناوەڕۆك و ووردەکاریەوە:

(ئۆساهیر) یەکێك بوو لەو قوتابیانەی کە لەنێو یەکێك لەو شاندانەی رەوانەی ئەڵمانیا کرابوو دەڵێت: (ئەگەر بە گوێی ئامۆژگاریەکانی مامۆستا ئەڵمانیەکەم بکردبا، کە لە زانکۆی هامبۆرگ وانەی پێدەگوتم ئەوا فێری هیچ نەدەبووم). حکومەتەکەمان منی رەوانەی ئەڵمانیا کردبوو تا بنەمای زانستی میکانیك بخوێنم، لە راستیداخەونم بە دروستکردنی بزوێنەرێکی بچووك دەکرد.

من دەمزانی هەموو پیشەسازیەك یەكەیەكی سەرەكی هەیە كە بە پێی دەڵێن (مۆدیل) و بە بنەمای هەر پیشەسازیەك دادەنرێت ، بۆیە گەر زانیت چۆن دروست دەكرێت، ئەوا دەستت گرتوە بەسەر هەموو نهێنیەكانی ئەم پیشەسازیە، بۆیە مامۆستاكانم لەبری ئەوەی بمبەنە كارگەیەك یان سەنتەرێكی راهێنانی پراكتیكی، ئەوا كتێبیان پێدەدام بۆ ئەوەی بیخوێنمەوە.

دەستم كرد بە خوێندنەوەی ئەم كتێبانە، تا شارەزایی تەواوم دەربارەی بیردۆزەكانی میكانیك بەدەستهێنا، بەڵام كاتێك لەبەردەم هەر بزوێنەرێك دەوەستام ، ئەوا وەك ئەوە وابوو كە بەرامبەر مەتەڵێك بم هەڵهێنانی نەبێت.

رۆژێكیان رۆژنامەم دەخوێندەوە،لە ناكاو چاوم بە هەواڵێك كەوت كە ریكلام بۆ كردنەوەی پیشانگایە كی بزوێنەری ئیتاڵی دەكات، وەلەبەر ئەوەی سەرەتای مانگ بوو من برەپارەیەكی باشم پێبوو و چووم بۆ ئەوێ. لەم پیشانگایەدا بزوێنەرێكم بینی كە هێزەكەی دوو ئەسپ بوو و، بەو پارەیەی كە پێم بوو كریم.

لەراستیدا بزوێنەرەكە زۆر قورس بوو بەڵام لەگەڵ ئەوە دا هەڵم گرت تا گەیاندمە ژوورەكەی خۆم و لەسەر مێزەكەم دانا و بە ووردی سەیرم دەكرد هەروەك بڵێی سەیری تاجێكی بە گەوهەر داپۆشراو بكەم، بۆیە لەدڵی خۆمدا گوتم: (ئەمە نهێنی هێزی ئەوروپایە، ئای ئەگەر دەمتوانی بزوێنەرێك دروست بكەم ! ئەوا مێژووی ژاپۆنم دەگۆڕی......). من لەگەڵ خۆمدا خەریكی ئەم قسانەبووم، لە چركەیەكدا خەتەرەیەكم بە دڵ داهات ! پێی گوتم، ئەم بزوێنەرە لەچەند پارچە و شێوازێكی جیا پێك هاتوە، ئەوتانیێ موگناتیسێكە لە شێوەی ناڵی ئەسپ و چەند تێلێك و قۆڵی ئاسنین و گوێزەرەوەی جووڵە و شتی تر....پێك هاتوە، ئەگەر من توانیم ئەم پارچانە لەیەك جیا بكەمەوە و بە شێوەی جاری یەكەم بیبەستمەوە، دواتر كارم

پێکرد و ئەویش کاری کرد ! ئەوا من هەنگاوێکم ناوە بەرەو ئاشکرا کردنی نهێنی (مۆدێل) ی پیشەسازی ئەوروپی.

کارەکە بۆ من وا ئاسان نەبوو بۆیە دەستم کرد بەگەڕان بەشوێن کتێبێکی تایبەت بە نەخشەی بزوێنەرەکان کاتی خۆی خوێندبوومەوە، دوای ماوەیەك لەگەڕان، لەنێو کتێبخانەکەم دۆزیمەوە.....پەڕێکی زۆرم ئامادە کرد بۆ نووسین و لەولاشەوە سندوقی کەل و پەلەکانم هێنا و دەستم کرد بە وێنە کردنی بزوێنەرەکە دوای ئەوەی قەپاغی سەر بزوێنەرەکەم لادا..... .

دەستم کرد بە پارچە کردنی بزوێنەرەکە، هەرچەند جارەی پارچەیەکم دەر دەهێنا ئەوا بە ووردی وێنەیم دەکێشا و ژمارەیەکم پێی دەدا، بەرە بەرە ئەم کارەم کرد تا بە تەواوی بزوێنەرەکەم پارچە پارچە کرد.

دوای ئەمە نۆرەی ئەوە هات کە جارێکی تر بیبەستمەوە، بۆیە بە ووردی بەپێی ئەو وێنەیەی کە کێشابووم بزوێنەرەکەم بەستایەوە..... من زۆر شلەژا بووم و دڵم خێرا لێیدەدا، چونکە ترسی ئەوەم هەبوو کار نەکات، بەڵام کاتێك بە کارم خست.... کەوتە کار..... خەریك بوو لەخۆشیان بفڕم...... چونکە سێ ڕۆژی تەواو خەریکی ئەم کارە بووم و ڕۆژانە تەنها یەك ژەم نانم دەخوارد و بای ئەوەندە دەخەوتم کە توانای کارکردنم ببێت.

هەواڵی ئەم کارەم بە سەرۆکی شاندەکەمان گەیاند و ئەویش گوتی: (شتێکی باشت کردوە، ئێستاکە پێویست بەوە دەکات تاقیت بکەمەوە، من بزوێنەرێکی لەکار کەوتووت بۆ دێنم، تۆش پارچە پارچەی بکە و شوێنە هەڵە و دروستەکە بدۆزەوە و چاکی بکەوە و ئەم بزوێنەرە لەکار کەوتوەم بۆ بە کار بیەخەوە).

بۆ ئەم کارە پێویستیم بە (١٠) رۆژ بوو، دوای کردنەوەی بزوێنەرەکە هۆکاری لەکار کەوتنەکەم دۆزیەوە، بۆم دەرکەوت کە سێ پارچە لە بزوێنەرەکە داخورا بوو، توانیم بە دەستی خۆم پارچەی نوێی بۆ دروست بکەم.

هەواڵی سەرۆك شاندەکەم دا بە دوایین گۆڕانکاریەکانی کارەکەم، ئەویش فەرمانی پێکردم کە هەموو پارچەکان بەدەستی خۆم دروستیان بکەم و پاشان بیبەستمەوە!

لە راستیدا ئەم سەرۆك شاندەمان رابەرێکی رۆحی و هاندەرێکی باش بوو بۆم،بۆیە لەبری ئەوەی خۆم ئامادە بکەم بۆ دکتۆرا نامەکەم هەروەك مامۆستا ئەڵمانیەکانم داوایان لێکردم، چوومە نێو کارگەی تواندنەوەی ئاسن و سفر و ئەلەمنیۆم، بووم بە کرێکارێکی تواندنەوەی کانزاکان، بەرگێکی شینم پۆشی و لەبەر دەستی کرێکارێك کارم دەکرد، بەگەورە سەیریم دەکرد و وەك بەردەستێك فەرمانەکانیم بەجێدەگەیاند، تەنانەت لە نان خواردنیشدا خزمەتم دەکرد، ئەگەر چی بە رەچەڵەك لە خانەوادەی سامۆرای بووم، بەڵام چونکە خزمەتکردنی ژاپۆن مەبەستی من بوو، بۆیە لە پێناو ژاپۆندا ئامادەی هەموو کارێك بووم !.

هەشت ساڵی رەبەق، خەریکی ئەم لێکۆڵینەوە و راهێنانانە بووم، رۆژانە ١٠-١٥ کاتژمێر. خەریکی کار کردن بووم، کە شەو دادەهات نۆبەتی ئێشکگریم دەکرد، لەو کاتەدا پێداچوونەوەم دەکرد بۆ بنەماکانی هەر پیشەسازیەك لەسەرسرووشتی خۆی.

(میکادۆی) دەسەڵاتداری ژاپۆن بە کارەکانی منی زانی، بۆیە (٥٠٠٠ جونەیهی زێڕی ئینگلیزی) لە سامانی تایبەتی خۆی بۆ م رەوانە کرد، منیش هەڵسام بە کڕینی کەرەستە و پێداویستی کارگەیەکی تەواو، بەڵام کاتێك کە ویستم رەوانەی ژاپۆنی بکەم، نەمتوانی چونکە پارەکە تەواو ببوو ، منیش هەرچی پارە و

پاشەکەوتم هەبوو کۆمکردەوە و دام بە کرێی ئەو کەشتیەی کە کارگەکەم بۆ دەگەیەنێتە ژاپۆن.

کە کارگەکە گەیشت (میکادۆ) ویستی چاوی پێم بکەوێت بەلاّم من بڕیارم دا نەچمە دیداری تا کارگەی بزوێنەر دانەمەزرێنم.

ئەم کارەم (۹) ساڵی خایاند، تا ئەو ڕۆژە هات بە خۆم و یاریدەدەرەکەم (۱۰) بزوێنەرمان لەگەڵ خۆمان بردە کۆشك کە لە دروستکردنی (ژاپۆن) بوو.

کاتێك (میکادۆ) هاتە ناو کۆشك ئێمەش سلاّومان لێکرد، ئەو زۆر دڵی بە ئێمە و بەرهەمەکەمان خۆش بوو، وەختێك بزوێنەرەکانمان بە کار خست ئەو پێکەنی و گوتی: ئەمە خۆشترین مۆسیقایە کە لە ژیانمدا دەیبیستم، دەنگی بزوێنەری ژاپۆنی.

بەم شێوەیە نهێنی (مۆدیل) مان بەدەست هێنا کە نهێنی هێزی ئەوروپا بوو، گواستمانەوە بۆ ژاپۆن، هێزی ئەوروپامان گواستەوە بۆ ژاپۆن، ژاپۆنیشمان گواستەوە بۆ ڕۆژ ئاوا.

## خواستەکانت ڕێك بکە

لە یەکێك لە کتێبەکانی دانایی و چیرۆکەکانی چینی کۆندا هاتوە کە پادشایەك ویستی یەکێك لە هاولاتیانی خۆی خەلات بکات، بۆیە پێی گوت: چەند زەویت بە رۆیشتن بڕی ئەوا دەبێتە مولکی تۆ........

پیاوەکە زۆر دلی خۆش بوو بەم دیاریە بۆیە دەستی کرد بە رۆیشتن....بەمە دلی ئاوی نەخواردەوە، بۆیە وەك شێت رای دەکرد چونکە پێیوابوو رووبەرێکی زۆرتری دەست دەکەوێت، ماوەیەکی زۆر رای کرد....ماندوو بوو.....دیسان دەستی کردەوە بەرۆیشتن......تا وای لێهات توانای رۆیشتنی نەما....بیری لەوە کردەوە کە بگەرێتەوە لای پادشا بۆ ئەوی ئەم رووبەرە زەویەی پێبدات.....بەلام لە چرکە ساتێکدا راکەی خۆی گۆری و برِیایدا بەردەوام بێت لە رۆیشتن......ماوەیەکی زۆری بڕی........دیسان وەستا و بریاریدا بگەرێتەوە لای پاشا تا ئەو زەویەی پێبدات.......بەلام جارێکی تر بڕیارەکەی خۆی گۆڕی و ویستی ماوەیەکی تریش بڕوات تا زەویەکی زۆرتر بەدەست بێنێت.....

ئەم پیاوە بەردەوام بوو لە رۆیشتن....رۆیشت......رۆیشت، هێندە رۆیشت ئیتر کەس نەیبینیەوە.....ئەو رێگەی خۆی وون کرد و لە ژیاندا وون بوو.......هەندێکیش دەلێن بەهۆی ماندوو بوونی زۆرەوە گیانی لەدەست دا.

ئەم پیاوە نە بوو بە خاوەنی شتێك.......نە هەستی بە خۆشی و کیفایەت کرد چونکە سنوورێکی بۆ قەناعەتکردن نەبوو.

## ..سەرکەوتنی بە ئەندازە..

هاوارێکە لۆراناش و هەوارد ستیفنسۆن بەگوێی خەلکیان دادا، هۆشداریاندا لەو سەرکەوتنە ساختەیەی کە تەمەنی مرۆڤ راو دەکات، ئەو مرۆڤەی کە بەردەوام تینووی بەدەستهێنانی شتەکانە بێ ئەوەی هەست بە تێر بوون بکات.....کێ دەتوانێت لەکاتی گەنجاودا بلێت نا، بەرگەی ناوداری و شۆرەت و سامان و پلەو پایە بگرێت!؟ لەم دونیایەدا خواست سنووری نیە...... بۆیە دەبێت ئەوەندە هەڵبژێریت کە پێویستتە و بلێیت بەم ئەندازەیە رازین....

خواست وەك تەڵە وایە.......وا دەزانی راوی پێدەکەیت.....کەچی خۆت نێچیرە گران بەهاکەی......گەر باوەڕ ناکەیت؟! ئەم چیرۆکە بخوێنەوە:

دوو هاورێ چوونە راوە ماسی، یەکێکیان ماسیەکی زۆر گەورەی راو کرد و لەناو سەبەتەکەی دانا و ویستی بڕوات....

یەکەم گوتی: بۆ کوێ؟

دووەم: بۆ ماڵەوە، من ماسیەکی زۆر گەورەم راو کردوە، بەشی هەموومان دەکات....

یەکەم: بوەستە، وەك من ماسی گەورەی زیاتر راو بکە....

دووەم: بۆ ئەمە بکەم.......؟!

یەکەم: چونکە کاتێك ماسی زیاترت راو کرد دەتوانیت بیفرۆشیەوە..........

دووەم: باشە بۆ ئەمە بکەم......؟!

یەکەم: تا پارەی زیاتر بەدەست بێنیت.....

دووەم: باشە بۆ پارەی زیاتر بەدەست بێنم....؟!

یەکەم: دەتوانیت پاشەکەوتی بکەیت و پشتیوانەت لە بانك زیاد دەبێت.

دووەم: بۆ ئەمە بکەم....؟!

یەکەم: تا دەوڵەمەند بیت....؟!

دووەم: چی لە دەوڵەمەندی بکەم.....؟!

یەکەم: تا لەو رۆژەی کە بەنێو ساڵدا چوویت، بتوانیت لەگەڵ خانەوادەکەت کاتێکی خۆش بەسەر بەریت.

هاوڕێی دووەم ژیرانە وەڵامی هاوڕێکەی خۆی دایەوە و گوتی: ئەوەی تۆ دەیڵێیت من ئێستاکە وا پەیڕەوی دەکەم و نامەوێت دوای بخەم بۆ ئەو کاتەی کە پیر دەبم و تەمەنم بە زایە دەچێت......

پیاوێکی ژیرە....وانیە!

دەڵێن: دوا رۆژ هی خاوەن پرسیارە سەختەکانە...بەلاّم لەم جیهانەدا وەك – فنسنت بۆسنت- دەڵێت مرۆڤ وەك مێرووڵەی سەر پشتی فیلی لێدێت.....روە و خۆر ئاوا دەڕوات کەچی فیلەکە روە و خۆر هەلاّت هەنگاو دەنێت و ئەستەمە بگاتە مەبەست....بۆ؟....چونکە ئەقڵی مرۆڤ تەنها بە ۲۰۰۰ خانە کاردەکات....بەلاّم ئەقڵی ناوەوەی بە٤،٠٠٠،٠٠٠ خانە، بەم شێوەیە مرۆڤ لە نێوان دوو جەنگدا دەژیێت...جەنگێك لەگەڵ خۆی، ئەوەی تریش لەگەڵ ئەم جیهانە گۆڕاوە....تا بگاتە نهێنی خۆش نوودی.

# نهێنی کامەرانی

دەگێڕنەوە بازرگانێك کوڕەکەی ناردە لای حەکیم ترین کەس لەجیهان تاوەکو فێری (نهێنی کامەرانی) بێت....

ئەم کوڕە دوای ٤٠ رۆژ لە گەشت کردن گەیشتە کۆشکێکی جوان کە لەسەر لووتکەی چیایێك بوو، ئەم کۆشکەماڵی داناترین کەسی جیهان بوو. کە چووە ناو کۆشکەکە بینی خەڵکێکی یەکجار زۆر لە ئژوورەوەن و ئەویش دانیشت تا نۆرەی بێت و بچێتە لای حەکیمەکە.

دوو کاتژمێر چاوەڕێی کرد تا نۆرەی هات... حەکیمەکە زۆر بە ووردی گوێی لێگرت، پاشان پێی گوت، ئێستا کاتمان نیە، داوای لە کوڕەکە کرد گەشتێك بەنێو کۆشکەکەدا بکات و دوای دوو کاتژمێر چاوی پێبکەوێتەوە..... حەکیمەکە کەوچکێکی هێنا دوو دڵۆپە رۆنی تێدابوو، و بە کوڕەکەی گوت: بەدرێژایی گەشتەکەت بەنێو کۆشکەکە ئەم کەوچکە لەدەست بگرە، ئاگادار بە رۆنەکە نەڕژێت!.

گەنجەکە دەستی کرد بە گەشتکردن بە نێو کۆشکەکەدا و بەسەر پێبلیقانەکان دەکەوت و دەهاتە خوارەوە و چاویشی هەر لەسەر کەوچکەکە بوو. دوای دوو کاتژمێر گەڕایەوە لای حەکیمەکە و ئەویش لێی پرسی: مافوورە فارسیەکەت بینی لە چێشتخانەکەدا؟...

باخچەکە جوان بوو....؟ ئەی کتێبە ناوازەکانی ناو کتێبخانەکەم سەرسامی کردی....؟ کوڕەکە شلەژا و دانی بەوەنا کە هیچ شتێکی نەبینیوە....چونکە خەمی یەکەمی پارێزگاریکردن بوو لە رۆنەکەی ناو کەوچکەکە.

حەکیمەکە گوتی: تۆ ناتوانیت پشت بە کەسێك ببەستیت کە نەزانێت لەو ماڵەی کە تێیدا دەژێت چی تیایە....بۆیە گەنجەکە سەر لە نوێ دەستی کردەوە بە گەشت بە نێو کۆشکەکە و ئەمجارەیان تێبینی دیمەنە دڵ رفێن و ناوازەکانی ناو کۆشکەکەی کرد کە لەسەر دیوارەکان نەخشێنرابوو، سەیری باخچە و گوڵە جوانەکانی کرد، پاشان گەڕایەوە لای حەکیمەکە و بە ووردی باسی لەو شتانە کرد کە بینیبووی... لێرەدا حەکیمەکە پێی گوت: ئەی کوا ئەم دوو قەترەیەی کە داوام لێکردی پارێزگاری لێبکەیت؟

کوڕەکە سەیری کرد دوو دڵۆپەکە رژاوە و نەماوە، حەکیم پێی گوت: ئەو ئامۆژگاریەی کەدەتوانم بۆ تۆی بکەم ئەوەیە: نهێنی کامەرانی ئەوەیە تۆ جوانیەکانی دونیا ببینیت و چێژی لێوە ربگریت بێ ئەوەی دوو دڵۆپە رۆنەکە بڕژێت لەدەستت.

کوڕەکە لە مەبەستی چیرۆکەکە گەیشت، کە کامەرانی بریتیە لە ئەنجامی لێکدانی هاوسەنگی لە نێوان شتەکان، دوو دڵۆپەش تەندروستی و (ستر) کردنە....چونکە ئەمانەپێکهای سەرکەوتوون دژی بەد بەختی.

ئێدوارد دی بۆنۆ دەڵێت:

باشترین پێناسەی بەد بەختی بریتیە لەو بۆشاییەی کە لەنێوان تواناکانمان و پێشبینیەکانمان دا هەیە، ئێمە لەم ژیانەدا بە ئەقڵی سمۆرە دەژین، سمۆرە توانای رێکخستنیان نیە سەرەڕای چالاکی و زیندوییان، ئەو، هەموو ژیانی خەرج دەکات لە کۆ کردنەوەی بوندوقی زۆرتر لە پێداویستی خۆی. هەتاکەی رادەکەین، هەر کۆدەکەینەوە و کۆ دەکەینەوە و ناڵێین بەس و ئاستێك بۆ خواستەکانمان دانانێین کە بگونجێت لەگەڵ تواناکانمان.

# چیرۆکێکی زۆر خۆش

ڕۆژێکیان موسا صەلات و سەلامی خوای لەسەر بێت لە کاتی موناجاتکردنیدا لەگەڵ پەروەردگاردا، داوای لێکرد کە هاومەجلیسی خۆی لە بەهەشتا پیشان بدات، جوبرائیل یەکسەر هاتە خزمەت موساو پێی گوت: هاو مەجلیست فلانی قەسابە.....لە گەڕەکی فلانی.

موسا صەلات و سەلامی خوای لەسەر بێت چوو بۆ دوکانی قەسابەکە و بینی گەنجێکە بە نۆبەتگری شەوان دەچێت،و خەریکی گۆشت فرۆشتنە. موسا بەردەوام بوو لە چاودێریکردنی ئەم گەنجە تا بزانێت چی وای لەم گەنجە کردوە ببێتە هاو مەجلیسی ئەو، بەڵام هیچ شتێکی نامۆی نەبینی.

کە شەو داهات، قەسابەکە بڕێك گۆشتی لەگەڵ خۆی هەڵگرت و بەرە و ماڵەوە بەڕێکەوت، موساش بە شوێنیدا کەوت، و داوای لێکرد ئەم شەو داڵدەی بدات و لای بمێنێتەوە بێ ئەوەی خۆی پێبناسێنێت... ئەویش بە سینەیەکی فراوان داواکەی قبوڵ کرد و لەماڵەکەی خۆیدا پێشوازیەکی جوانی لێکرد. موسا بەردەوام بوو لە چاودێریکردنی ئەم گەنجە، بینی خواردن ئامادە دەکات و زەمبیلێکی هێنایە خوارەوە کە لە بنمیچی ژوورەکەی هەڵواسیبوو و پیرەژنێکی لێهێنایە خوارەوە. جوان ئەم پیرەژنەی پاك کردەوە و و جل و بەرگی گۆڕی و بەدەستەکانی خۆی خواردنی پێدا. دوای تەواو بوونی نان خواردنەکە پیرەژنەکەی گێڕایەوە شوێنی خۆی. موسا بینی ئەم پیرەژنە هەندێك ووشەی نامۆ لەدەمیدا دەردەچێت، پاشان کوڕەکە بە ئەرکی مێوانداری هەستا و خواردنی ئامادە کرد بۆ میوانەکەی کە موسایە و دەستیان کرد بە نان خواردن.

موسا لێی پرسی: ئەم پیرەژنە کێیە؟

گەنجەکە: ئەمە دایکمە......خزمەتی دەکەم

موسا: دایکت شتێکی گوت نەمزانی چیە دەکرێت بزانم چی گوت؟

گەنجەکە: هەر کاتێك خزمەتی بکەم دەڵێت....خودا لێت خۆش بێت و لە ڕۆژی دواییدا ببیتە هاو مەجلیسی موسا لە ژێرگومەزەکەی و هەمان پلەت پێببەخشێت.

موسا بە گەنجەکەی گوت: مزگێنیت پێدەدەم ئەی لاو خودا نزای دایکەکەتی گیرا کردوە. من تکام لە خوا کرد کە هاو مەجلیسەکەم پیشان بدات لە قیامەتدا، ئەو کەسەش تۆ دەرچوویت زۆر چاودێری کار و کردەوەکانتم کرد، هیچ شتێکی وام لە تۆ نەبینی جگە لەوەی کە ڕێزێکی زۆری دایکت دەگریت و قەدرت گرتوە و چاکەت بەرامبەری نواندوە. ئەمەش پاداشتی ئیحسان و ریز گرتنە لە دایك و باوك.

# مرۆڤ گوناه کاره چاکترین گوناه کارانیش تۆبەکارانن

ثعلبەی کوڕی عەبدورڕەحمان خودا لێی رازی بێت یەکێك بوو لەوانەی کە خزمەتی پێغەمبەری خوای دەکرد صەلات و صەلات و سەلامی خوای لەسەر بێت لە هەموو کارەکانی.....

رۆژێکیان پێغەمبەری خوا بە کارێك رەوانەی کرد بۆ شوێنێك.....لەکاتی رۆیشتنی بۆ کارەکە بینی دەرگای ماڵی پیاوێکی پشتیوانان (ئەنسار) کراوەتەوە و ژنێك خۆی دەشۆرێت، ثعلبة خۆی بۆ نەگیراو سەیری ژنەکەی کرد....هێندەی پێنەچوو سامێك دایگرت....ترسا لەوەی سرووش بەسەر پێغەمبەری خوا دابەزێت و باس لەکردەوەکەی ثعلبة بکات..بۆیە نەگەڕایەوە لای پێغەمبەری خوا، بەڵکو چوە نێو چیاکانی نێوان مەککە و مەدینە...

ثعلبة ٤٠ رۆژ لەو شوێنە مایەوە.....لێرەدا جبریل صەلات و صەلات و سەلامی خوای لەسەر بێت دابەزی و هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا و پێی فەرموو.....ئەی موحەممەد...پەروەردگارت سڵاوت لێدەکات و دەفەرموێت: پیاوێك لە ئومەتەکەت لەنێو چاڵێکایە لە نێو چیاکان،پەنای بە من گرتوە...

پێغەمبەری خوا بە عومەر و سەلمانی گوت: بڕۆن بە شوێن ثعلبة ی کوڕی عەبدورڕەحمان، جگە لەو مەبەست کەسی تر نیە.

عومەر و سەلمان لە مەدینە هاتنە دەرەوە بە شوێن ثعلبة دا بگەڕێن......

لەکاتی گەڕانەکەیان شوانێکیان بینی و لێیان پرسی: ئایا هیچ زانیاریەکت هەیە لەسەر لاوێك لە نێو ئەم چیایانەیە پێی دەڵێن ثعلبة؟

شوانەکە گوتی: مەبەستت ئەوی لە دەست جەهەننەم رای کردوە؟

عومەر فەرمووی: چۆن دەزانی لە دەست جەهەننەم رای کردوە؟

شوانەکە گوتی: چونکە هەرکە شەو داهات، لە نێو ئەم چیایانە دەدێتە دەرەوە و.....دەستەکانی لەسەر سەری دادەنێت و هاوار دەکات: خۆزگە رۆحمت بکێشابا لە نێو رۆحەکان... جەستەشم لە نێو جەستەکان......خۆزگە زیندووم نەکەیەوە بۆ رۆژی حەق و حیساب..؟

عومەر گوتی: بەڵێ ئەم پیاوەمان گەرەکە.....

شوانەکە هەردووکیانی بۆ شوێنی ثعلبة برد......

عومەر کە ثعلبة ی بینی بۆلای رۆیشت و لە باوەشی گرت.....

ثعلبة گوتی: ئایا پێغەمبەری خوا بە گوناهەکەمی زانی؟

عومەر گوتی: نازانم بەڵام دوێنێ باسی تۆی کرد....بۆیە من و سەلمانی بە شوێن تۆدا ناردوە.

ثعلبة بە عومەری گوت توخوا یەکسەر مەمبەرنە لای.....با لەوکاتە بێت کە ئەو خەریکی نوێژ خوێندنە، بەم شێوەیە هەرسێکیان گەڕانەوە لای پێغەمبەری خوا.

لە ناو مزگەوتدا عومەر و سەلمان لە ریزی نوێژداپێش ثعلبة کەوتن، کاتێک کە پێغەمبەری خوا صەلات و صەلات و سەلامی خوای لەسەر بێت لە نوێژ خوێندندا سەلامی دایەوە گوتی:

ئەی عومەر، ئەی سەلمان، ثعلبة چی بەسەر هات؟

عومەر گوتی: ئەوەتا لێرەیە ئەی پێغەمبەری خوا.....

پێغەمبەری خوا لە شوێنی خۆی هەڵسا و بۆ لای ثعلبة هات و بە نەرمی جووڵاندی ئەویش بێدار بوویەوە......، پێغەمبەری خوا فەرمووی: چی وای لەتۆ کرد بەمشێوەیە لێم دوور بکەویت ئەی ثعلبة؟

ثعلبة گوتی: گوناهم ئەی پێغەمبەری خوا.......

پێغەمبەر فەرمووی: ئایەتێکت پێبڵێم کە هەموو گوناه و تاوانێك رەش دەکاتەوە؟

گوتی: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا.....

پێغەمبەر فەرمووی: بلێ: ﴿ ربنا آتنا في الدنيا حسنة وفي الآخرة حسنة وقنا عذاب النار ﴾

ثعلبة گوتی: بەڵام گوناهەکەم گەورەترە.

پێغەمبەر فەرمووی: بەڵکو ووتەی خوا گەورە ترە، پاشان فەرمانی پێکرد بچێتە ماڵەوەی خۆی.

هەشت رۆژ بەسەر گەڕانەوەی ثعلبة تێپەڕی.....بەڵام ثعلبة ئەو کوڕەی جاران نەماوە! لەم رۆژەدا سەلمان خێرا هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا سەلامی خوای لەسەر بێت....و پێی فەرموو: ئەی پێغەمبەری خوا دەکرێت سەردانێکی ثعلبة بکەیت؟ ئەو بەهۆی ئەوەی کە لێی روویداوە لەسەرە مەرگدایە؟

پێغەمبەری خوا فەرمووی: هەستن با بچینە لای ثعلبة....

کە گەیشتنە ژوورەکەی پێغەمبەری خوا لە تەنیشتیەوە دانیشت و سەری ثعلبة ی لەسەر کۆشی خۆی دانا.....

بەڵام ثعلبة خێرا سەری خۆی لەسەر کۆشی پێغەمبەر لابرد.......

پێغەمبەر فەرمووی: بۆچی سەرت لادا ئەی ثعلبة؟

گوتی: لەبەر ئەوەی پڕە لە گوناه.......

پێغەمبەر فەرمووی: بە دەست چیەوە دەناڵێنیت؟

گوتی: بەدەست شتێك وەك دەنگی جوولەی مێروولە وایە لە نێو گۆشت و ئێسقان و پێستمە....

پێغەمبەر فەرمووی: حەزت لە چیە؟.

گوتی: لێخۆش بوونی پەروەردگارم.

لەو کاتەدا جبریل هاتە خوارەوە و بە پێغەمبەر دەفەرموێت:

ئەی موحەممەد پەروەردگارت سلاّوت لێدەکات....و دەفەرموێت: ئەگەر ئەم بەندەیەم لە کاتی گەڕانەوەی بۆ لام بەقەد کەفی ئاو گوناە و تاوانی کردبێت، ئەوا بەقەد زەوی لێخۆش بوونی پێدەبەخشم و پێشوازی لێدەکەم....

یەکسەر پێغەمبەری خوا صەلات و صەلات و صەلات و سەلامی خوای لەسەر بێت ئەم موژدە و هەواڵە خۆشەی بە ثعلبة راگەیاند...ئیتر ثعلبة هاوارێکی لێهەڵساو گیانی پاکی سپارد. پاشان پێغەمبەری خوا فرمانی کرد بە شۆردن و کفن کردنی...

دوای ئەوەی پێغەمبەری حوا نوێژی لەسەر خوێند و بەرەو گۆڕستان بەرێکەوتن.......پێغەمبەری خوا لەسەر پەنجەکانی قاچی دەڕۆیشت....کە تەواو بوون لە ناشتنی، پێیان گوت ئەی پێغەمبەری خوا.. تۆمان بینی بەسەری پەنجەکانی قاچەکانت دەڕۆیشتیت؟

پێغەمبەری خوا فەرمووی: سوێند بەو کەسەی کە بەحەق منی بە پەیامبەر رەوانە کردوە، نەمتوانی پێیەکانم لەسەر زەوی دابنێم لەبەر زۆری ژمارەی ئەو فریشتانەی کە دابەزیبوون بۆ ئامادەبوون لە ناشتنی ثعلبة......

راستی فەرموە پێغەمبەری خوا....

مرۆڤ خەتا کارە......بەلاّم چاکترینیان ئەوانەن کە پەشیمان دەبنەوە و تەوبە دەکەن. بۆیە پێویستە خۆمان رابێنین لەسەر گەڕانەوەی راستی.....

# چیرۆکی سەرکەوتنی مرۆڤ

لە ٤ ساڵی.....سەرکەوتن ئەوەیە......میز بەخۆتدا نەکەیت

لە ٦ ساڵی....سەرکەوتن ئەوەیە......ماڵەکەت بدۆزیەوە دوای گەڕانەوە لە قوتابخانە

لە ١٢ ساڵی....سەرکەوتن ئەوەیە........تۆ هاوڕێت هەبێت

لە ١٨ ساڵی.....سەرکەوتن ئەوەیە..........مۆڵەتی شوفێری بەدەست بێنیت

لە ٢٠ ساڵی.....سەرکەوتن ئەوەیە..........پارە بەدەست بێنیت

لە ٣٥ ساڵی.....سەرکەوتن ئەوەیە..........پارە بەدەست بێنیت

لە ٤٥ ساڵی.....سەرکەوتن ئەوەیە..........پارە بەدەست بێنیت

لە ٥٥ ساڵی.....سەرکەوتن ئەوەیە..........پارە بەدەست بێنیت

لە٦٠ ساڵی.....سەرکەوتن ئەوەیە..........پارە بەدەست بێنیت

لە٧٠ ساڵی.....سەرکەوتن ئەوەیە.........پارە بەدەست بێنیت

لە ٧٥ ساڵی...سەرکەوتن ئەوەیە.....لەهەر کوێ بوویت ماڵەکەت بدۆزیەوە

لە ٨٠ ساڵی.....سەرکەوتن ئەوەیە..........میز بەخۆتدا نەکەیت

ژیان بەم شێوەیەیە......زۆر لەوە کەمترە کە بەدوای رادەکەین.....بۆیە کار بۆ رۆژی دواییت بکە.

# کوا رۆزیم

ژنێک هاتە لای پێغەمبەر داوود صەلات و سەلامی خوای لەسەر بێت و لێی پرسی:

ئەی پێغەمبەری خوا: پەروەردگاری تۆ...ستەمکارە.......؟ یان داد پەروەر........؟

هەوار بە ماڵت ژنەکە... ئەو ئەو دادپەروەرەیە کە هەرگیز ستەم ناکات.

پاشان پێی گوت: وەرە بزانم چیرۆکی تۆ چیە؟

ئەویش گوتی: من بێوەژنێکم ۳ کچم هەیە و بە رستن سەرپەرشتیان دەکەم، دوێنێ دوای ئەوەی بڕێکی باشم لە خوری رست و لە ناو چارۆکەیەکی گەورەم توند گرێدا، تا بیبەم بۆ بازاڕ بیفرۆشم و لەم پارەیە خۆراك و خواردن بۆ کچەکانم دابین بکەم، لە ناکاو باڵندەیەك هات و چارۆکەکەی لێبردم، منیش بەدەستی بەتاڵ مامەوە بێئەوەی بتوانم شتێك بۆ منداڵەکانم دابین بکەم!.

لەو کاتەی ژنەکە چیرۆکی خۆی بۆ پێغەمبەر داوود باس دەکرد، لە دەرگای ماڵی پێغەمبەر داوود درا، ئەویش مۆڵەتی دا بە هاتنە ژوورەوە، میوانەکە بریتی بوون لە ۱۰ بازرگانی گەورە و هەریەکەیان کیسەیەکی بەدەستەوە بوو کە ۱۰۰ دیناری تێدابوو، دوای سڵاو کردنیان لە داوود، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەم پارانە بدە بەوانەی کە شایەنین،

پێغەمبەر داوودیش پێی فەرموو ی: چی وای لێکردوون ئەم بڕە زۆرە پارەیە ببەخشن؟.

گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە لە ناو کەشتیەکدا بووین،لە ناکاو بایەکی توند هەڵیکرد و درزێکی گەورە لە کەشتیەکە دروست بوو و هیچمان لا نەبوو ئەم درزەی پێبگرین و هێندەی نەمابوو هەموومان نقوم ببین.

لە ناکاو باڵندەیەك هات و چارۆکەیەکی فڕەدایە ناومان، کە کردمانەوە برێکی زۆر لە خوری تێدا بوو ئێمەش درزەکەمان بە خوریەکە گرت و رزگارمان بوو، بۆیە بڕیارمان دا هەریەك لەئێمە دوای گەڕانەوەی بڕی ١٠٠ دینار ببەخشێت وەك شوکرانە بژێریەك بۆ رزگار بوونمان و ئەمەش پارەکەیە دەیخەینە بەردەستت.

لەو کاتەدا پێغەمبەر داوود سەیرێکی ژنەکەی کرد و گوتی: خوایەك لە ناو دەریا و لە ووشکانی بازرگانیت بۆ دەکات، تۆش بە ستەمکاری دەناسیت! هەر ١٠٠٠ دینارەکەی دا بە ژنەکە و پێی گوت: برۆ لە کچەکانتی خەرج بکە.

## دڵی دایکم

لە کاتی گەڕانەوەم بۆماڵەوە، بارانێکی بەخوڕ باری

خۆشك و براکانم گوتیان: بۆ چەترت لەگەڵ خۆت نەبرد؟

داپیرە و باپیرەم گوتیان: چاوەڕێت بکردایە تا باران دەوەستێت

باوکم گوتی: کە نەخۆش کەوتیت، ئاسەواری کارەکەت دەبینیت

بەڵام دایکم دەستی دایە پەشتەماڵێك و قژمی ووشك دەکردەوە و لەبەردەمی خۆیدا گوتی: نەدەکرا باران نەبارێت تا کوڕە شیرینەکەم دەگەڕێتەوە ماڵەوە.............بینیتان دڵی دایك چۆنە؟

# چیرۆکی لەیلا و گورگەکە بە پێی گێڕانەوەی ئەوی گورگەکە

باپیرەم گورگێکی زۆر باش و بەسۆز بوو، ئەوهەرگیز حەزی بەڕاو کردن و خواردنی گۆشت نەدەکرد، چونکە بڕیاریدا تەنها رووەك و سەوزە بخوات و ببێت بە رووەکی.
لەم دارستانەدا کچێکی بەد خوو هەبوو لەگەڵ داپیرەیدا دەژیا، ناوی لەیلا بوو......هەموو رۆژێك دەهاتە ناو دارستانەکەو خراپەکاری تێدا دەکرد، گوڵی هەڵدەکەند وئەو گژ و گیایانەی تێك دەدا، کە سەرچاوەی خۆراکی باپیرەم بوون و روخساری جوانی دارستانەکەی تێکدەدا.
چەندین جار باپیرەم ئامۆژگاری کرد ئەم رەفتارە ناشیرینانەی دووبارە نەکاتەوە بەڵام بێهوودە بوو، چونکە لەیلای شەڕانگێز هەموو جارێك دەگەڕایەوە سەر هەمان رەفتاری جارانی و گوڵی دەقرتاند و پێی دەنایە سەر گژو گیاکانی باپیرەم.
دوای ئەوەی باپیرەم بێئومێد بوو لە ئامۆژگاریکردنی لەیلا، بڕیاریدا سەردانی داپیرەی لەیلا بکات، ئەم داپیرەیەش وەك لەیلا شەڕانگێز بوو، بۆیە بەر لەوەی بزانێت باپیرەم بۆچی هاتوە و بەر لەوەی ووشەیەك لەدەمی دەربچێت دەستی دایە دارێك کە لە پشت دەرگاکەی دانابوو،و هێرشی کردە سەر باپیرەم.
باپیرە بەسۆز و باشەکەم کە هێرشی کرایە سەر لە لایەن داپیرە بەساڵاچوەکە ترس و بیم دایگرت و لە تاوەخۆی پاڵێکی نا بە داپیرەکە و ئەویش کەوت بە زەویدا و سەری بەر قەرەوێڵەکە کەوت و مرد.
کە باپیرەم ئەم دیمەنەی بینی زۆر خەمبار بوو و کاری تێکرد بۆیە دەستی کرد بە گریان و نەیدەزانی چی بکات، بیری لەوە کردەوە ئاخۆ لێرە بەدواوە لەیلای داماو

بەبێ دایپیرەی چۆن دەژێت؟ دەبێت چەندە خەفەت بار بێت کاتێك دەزانێت کە دایپیرەی مردووە؟ بۆیە لە کۆتاییدا باپیرەم بڕیاریدا لاشەی دایپیرەی لەیلا بشارێتەوە و جل و بەرگی ئەو بپۆشێت تا لەیلا وابزانێت ئەمە دایپیرەتی و سۆز و میهرەبانی خۆی بە لەیلا ببەخشێت. بەلاّم کاتێك لەیلای شەڕانگێز گەڕایەوە ماڵ، باپیرەم خێرا لەسەر قەرەوێڵەکە راکشا، هات سلاّو لەدایپیرەی بکات بینی لووت و گوێکانی گۆڕاوە و لە جاران گەورە ترن، چاوەکانی وەك چاوی گورگی باپیرەمی لێهاتوە و خۆ گۆڕینەکەی باپیرەمی ئاشکرا کرد و خێرا دەرگاکەی کردەوە و رایکرد. لەو رۆژەوە ئەم لەیلا شەڕانگێزە لە نێو خەڵکدا رایگەیاندوە کە باپیرە بەسۆزە باشەکەم شەڕانگێرە و دایپیرەی خواردوە و هەوڵی داوە ئەویش بخوات.....!؟ ئەمە دیدگای لایەنەکەی ترە کە هەرگیز لە چیرۆکی لەیلا و گورگەکە باس نەکراوە......کەواتە پێویستە رێز لە را و رای بەرامبەر بگرین!.

# ئاهەنگ

ببەخشن خوێنەرە بەڕێزەکانم......ئەم چیرۆکە بۆ هەموو ئەوانەیە کە نازانن دەزگای هاوسەرگیری بەڕێوە ببەن و نازانن چۆن هاوبەشی ژیانیان بکەن بە سەرچاوەی هێز، نەك لاواز کردنی......چونکە هاوسەرگیری سوننەتی خوایە لەسەر زەوی و مایەی خێر و خۆشی و هێزە.

شێرێك بڕیاریدا زەماوەند بکات، هاوسەرەکەی دەستنیشان کرد و ئاهەنگێکی گەورەی سازدا، هەرچی شێری ناوچەکەیە ئامادەی ئاهەنگەکە بوو و یەك بەیەك پیرۆز باییان لە شێر دەکرد، لە ناکاو کەروێشکێك لە شێرەکە نزیك بوویەوە و سلاوی لێکرد و پاشان پیرۆزبایی خۆی بە شێرەکە راگەیاند و پێی گوت: بەڕاستی دڵم زۆر خۆش بوو بە زەماوەند کردنت.

شێرەکە تۆزێك سەیری کردوو پێی گوت: دەکرێت جەنابتان بناسم؟

ئەویش لە وەلامدا گوتی: من هاوڕێیەکی کۆنی تۆم و بەیەکەوە دەچووینە راوکردن

شێرگوتی: ببەخشە من کەروێشکان ناناسم؟

کەروێشکەکە بزەخەنەیکی لێوە هات و گوتی: من پێشان شێر بووم، بەلام سالێکە زەماوەندم کردوە.

# چیرۆکی پیاوەتی

پیاوەتی راستەقینە مانای چی یە؟ ئایا بەڕاستی تۆ لە پیاوانی؟

پیاوەتی بە بەهێزی ماسولکە نیە!

پیاوەتی گوتنی ووشەیەکی شەرەفمەندانە و هەڵوێستی سەربەرزانەیە!

پیاوەتی بریتیە لە کۆمەکی و بەخشین و فیداکاری!

پیاوەتی ئەوەیە چاکە بەرامبەر ئەوانە بکەیت کە چاکەیان لەگەڵ کردویت و خراپە نەکەیت بەرامبەر ئەوانەی کە خراپەیان لەگەڵت کردوە.

پیاوەتی ئەوەیە رێز لە ئەوانی تر و بۆچوونەکانیان بگریت و بەکەم سەیریان نەکەی و بۆچوونەکانیان بە کەم نەزانیت.

پیاوەتی ئەوەیە حەق بێژ بیت و بەئاشکرا دەری ببڕی و لە قسەی لۆمەکاران نەترسیت!

پیاوەتی واتە مەردایەتی و جوامێری لە بەرزترین ماناکانی!

پیاوەتی واتە هەموو خاوەن مافێك مافی خۆی پێبدەی !

پیاوەتی واتە رەوشتی بەرز و مامەڵەی باش!

پیاوەتی واتە ئەوەی بۆخۆت پێتخۆشە، بەهەمان شێوە بۆ ئەوانی تریشت پێخۆش بێت !

پیاوەتی ئەوەیە مافی ستەم لێکراو بسەنیەوە لە ستەم کار!

پیاوەتی ئەوەیە لە هەموو بار و دۆخێکدا دەستی یارمەتی بۆ لێقەوماوان درێژ بکەیت!

پیاوەتی ئەوەیە قەدری خۆت بزانی و سنووری خۆت تێنەپەڕێنیت!

پیاوەتی ئەوەیە لە کاتی بالآ دەستیت دا بەخشندە و لێبوردە بیت، لەکاتی تووڕە بووندا دان بەخۆت بگریت!

پیاوەتی ئەوەیە بەدەستەکانت فرمێسک لە چاوەکانی هەژارێك بسڕیەوە!

پیاوەتی ئەوەیە بێگرفت بخەویت و ویژدانت ئاسوودەبێت و ستەمت نەکردبێت!

ئایا چەند لەو سیفەتانە لەخۆت بەدی دەکەیت..........؟

دەکرێت هەموو ئەم سیفەتانە لە پیاوێکدا کۆ ببنەوە، دەکرێت هەموو پیاوەکانیش لە یەك سیفەتدا کۆ ببنەوە.

ئێستاکە دەتوانیت لە خۆت بپرسیت: لە کام جۆری لەم پیاوانە.

## چیرۆکی شەقیقی بەلخی و حاتەمی ئەسەم

لەشەقیقی بەلخی دەگێڕنەوە کە جارێکیان لە حاتەمی ئەسەمی پرسی: تۆ ماوەیەک هاوەڵیەتی منت کرد... چی لەم هاوەڵیەتە فێر بوویت؟

حاتەمیش لە وەڵامدا گوتی: هەشت شتی لیٚ فێر بووم

**یەکەمیان:**

سەیری خەلکانم کرد......هەر کەسێك خۆشەویستێکی هەیە، کە خۆشەویستەکە گەیشتە ناو گۆڕەکەی ئەوا جێیدێلێت.......منیش چاکەکانم کرد بە خۆشەویستی خۆم تا لە گۆڕدا بێنێتەوە لەگەڵم.

**دووەمیان:**

کە سەیری ئەو ئایەتەم کرد:

﴿وَأَمَّا مَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ وَنَهَى ٱلنَّفْسَ عَنِ ٱلْهَوَىٰ ﴿٤٠﴾﴾ (النازعات: ٤٠)

واتە: (نەفسەکەی خۆی دوور خستەوە لە ئارەزووە خراپەکان)

ئەوا تێکۆشام بۆ دوور خستنەوەی ئارەزوو لە نەفسەکەم تا لەسەر گوێڕایەڵی کردنی فەرمانەکانی خوا جێگیر بوو.

**سێیەمیان:**

بینیم هەر کەسێك شتێکی لا بەهادارە و پارێزگاری لێدەکات. دواتر سەیری ئەم ئایەتەم کرد کە دەفەرموێت:

﴿مَا عِندَكُمْ يَنفَدُ وَمَا عِندَ ٱللَّهِ بَاقٍ وَلَنَجْزِيَنَّ ٱلَّذِينَ صَبَرُوٓا۟ أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٩٦﴾﴾ (النحل: ٩٦)

واتە: (ئەوی لاتانە نامێنێت، ئەوی لای خوایە هەر دەمێنێتەوە)

بۆیە هەر شتێکی بەها دارم دەستکەوتبێت ئەوا روی ئەم شتەم لەخوا کردوە تا خوای گەورە لە لای خۆی بۆم هەڵیبگرێت.

## چوارەمیان:

بینیم خەڵك لە شتەکاندا دەگەڕێنەوە بۆ پارە و بنەماڵە و رەچەڵەك... کە ئەمەش هیچ نیە........سەیری ئەم ئایەتەشم کرد کە دەفەرموێت:

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقۡنَٰكُم مِّن ذَكَرٖ وَأُنثَىٰ وَجَعَلۡنَٰكُمۡ شُعُوبٗا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓاْۚ إِنَّ أَكۡرَمَكُمۡ عِندَ ٱللَّهِ أَتۡقَىٰكُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٞ ﴾ (الحجرات: ١٣)

واتە: (بەڕێزترینتان لای خوا پارێزکار ترینتانە، خودا زانا و شارەزایە)

ئیتر کارم بە تەقوا کردن کرد تا لای خودا بەخشندە بم.

## پێنجەمیان:

بینیم خەڵك ئیرەیی بە یەکتر دەبەن، ئەم ئایەتەم بیر کەوتەوە کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَهُمۡ يَقۡسِمُونَ رَحۡمَتَ رَبِّكَۚ نَحۡنُ قَسَمۡنَا بَيۡنَهُم مَّعِيشَتَهُمۡ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۚ وَرَفَعۡنَا بَعۡضَهُمۡ فَوۡقَ بَعۡضٖ دَرَجَٰتٖ لِّيَتَّخِذَ بَعۡضُهُم بَعۡضٗا سُخۡرِيّٗاۗ وَرَحۡمَتُ رَبِّكَ خَيۡرٞ مِّمَّا يَجۡمَعُونَ ﴾ (الزخرف: ٣٢)

واتە: (ئێمە بژێوی ژیانمان لە نێوانیان دا دابەش کردوە) ئیتر بەیەکجاری ئیرەییم لەخۆم قەدەغە کرد... چونکە ئیرەیی بردن رەخنە گرتنە لەخوای گەورە

**شەشەمیان:**

بینیم خەڵك دژایەتی یەکتر دەکەن.....سەیری ئەم ئایەتەم کرد کە دەفەرموێت:

﴿إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ لَكُمْ عَدُوٌّ فَٱتَّخِذُوهُ عَدُوًّا ۚ إِنَّمَا يَدْعُوا۟ حِزْبَهُۥ لِيَكُونُوا۟ مِنْ أَصْحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ ﴿٦﴾

فاطر: ٦

واتە: (شەیتان دوژمنی ئێوەیە، ئێوەش بە دوژمنی خۆتانی بزانن)

وازم لە دژایەتی خەڵك هێنا و تەنها شەیتانم بە دوژمنی خۆم ناسی

**حەوتەمیان:**

خەڵکانم بینی خۆیان ریسوا دەکەن لەپێناوی رۆزی و سەیری ئەم ئایەتەم کرد کە دەفەرموێت: ﴿وَمَا مِن دَآبَّةٍ فِى ٱلْأَرْضِ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِ رِزْقُهَا وَيَعْلَمُ مُسْتَقَرَّهَا وَمُسْتَوْدَعَهَا ۚ كُلٌّ فِى كِتَٰبٍ مُّبِينٍ ﴿٦﴾ هود: ٦

واتە: (هەرچی لەسەر ئەم زەویەدا دەژیت رۆزیەکەی لەسەر الله یە)

ئەوا کارم لەسەر ئەم شتانە کرد کە هی خوایە و دەبێت بیکەم... وە ئەوەی هی من بوو لای خوام جێهێشت چونکە متمانەم پێی هەیە، و گومانم لە دەوڵەمەندی نیە.

**هەشتەمیان:**

خەڵکانم بینی پشتیان بەستوە بە بازرگانی و پیشەکانیان و تەندروستی جەستەکانیان......منیش پشتم بە خوا بەست..... ﴿فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ لِنتَ لَهُمْ ۖ وَلَوْ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ ٱلْقَلْبِ لَٱنفَضُّوا۟ مِنْ حَوْلِكَ ۖ فَٱعْفُ عَنْهُمْ وَٱسْتَغْفِرْ لَهُمْ وَشَاوِرْهُمْ فِى ٱلْأَمْرِ ۖ فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُتَوَكِّلِينَ ﴿١٥٩﴾ ﴾

(آل عمران: ١٥٩)

# نامەیەك

باوکێك بەهۆی کەمدەرامەتی هاوسەر و سێ منداڵەکەی خۆی جێهێشت و چوو بۆ وڵاتێکی تر. ئەم خانەوادەیە باوکەکەیان زۆر خۆش دەویست و ڕێزێکی زۆریان لێدەنا،چونکە بەڕاستی نموونەی باوکی دڵسۆز و خەمخۆر و میهرەبان بوو.

دوای ماوەیەك لە گەشتەکەی، باوکەکە نامەیێکی بۆ خانەوادەکەی نارد، منداڵەکانی نامەکەیان نەکردەوە، بەڵکو هەریەکەیان نامەکەی بۆن دەکرد و ماچی دەکرد و دەیگوت ئەم نامەیە لە خۆشەویسترین کەس بۆمان هاتوە.

ئەوان سەیری دەرەوەی نامەکەیان کرد و لە نێو قوتوویەکی جوان پاراستیان. ناوە ناوە سەیرێکی نامەکەیان دەکرد و تۆزیان لەسەری لادەداو لە شوێنی خۆیان دادەناوە. بەم شێوەیە یەك نامەی باوکیان نەخوێندەوە بەڵکو هەر نامەیەك کە دەگەیشت هەڵیان دەگرت بێ ئەوەی ناوەرۆکی نامەکە بزانن.

چەند ساڵ تێپەڕی......

باوکەکە گەڕایەوە ماڵ بە هیوای ئەوەی کە خۆشی ببینێت،کەچی تەنها کوڕێکی لە ماڵ مابوویەوە! دوای پشوویەکی کورت لە کوڕەکەی پرسی: ئەی کوا دایکت؟

کوڕەکە: تووشی نەخۆشیەکی توند بوو، پارەی پێویستمان نەبوو چارەسەری بکەین، کۆچی دوایی کرد.

باوك: بۆ! ئەی نامەی یەکەمتان نەکردەوە، من لەم نامەیەدا بڕێکی زۆد پارەم بۆتان ڕەوانە کردبوو!

کوڕەکە: نەخێر نەمانکردەوە باوکە گیان

باوك: ئەی کوا براکەت؟

کوڕەکە: هەندێك هاوەڵی خراپی ناسی، دوای مردنی دایکم کەس نەبوو ئامۆژگاری بکات و راستی بکاتەوە....

باوکەکە بە سەرسوڕمانەوە: ئاخر بۆ! ئەو نامەیەی نەخوێندەوە کە تیایدا داوام لێکردبوو دوور کوێتەوە لە برادەری خراپ و بێتە لام؟

کوڕەکە گوتی: نەخێر باوکە گیان

باوکە گوتی: لاحول ولا قوە إلاّ باللە... ئەی کوا خوشکەکەت؟

کوڕەکە: زەماوەندی لەگەڵ کوڕێك کرد. ئەو نامەیەکی بۆ رەوانە کردی داوای رای تۆی کرد دەربارەی ئەم کوڕە و ئێستاکەش لە ژیانێکی زۆر ناخۆش و سەخت بەسەر دەبات.

باوکەکە: بۆچی زەماوەندی کرد لەگەڵ ئەم کوڕە؟ مەگەر لە وەڵامی نامەکەیدا نەمگوتبوو کە ئەم کوڕێکی ناشیاوە و و شۆرەتی باش نیە ببێتە هاوسەری و من رازی نیم بەم هاوسەرگیریە؟ یان ئەویش نامەکەمی نەخوێندۆتەوە؟

کوڕەکە: نەخێر باوکە گیان هیچ نامەیەکی تۆمان نەخوێندۆتەوە، بەڵکو هەموو جارێك ماچمان دەکرد و لە نێو ئەم قوتوەدا پاراستوومانە!.

زۆر بیرم لە حاڵی ئەم خێزانە کردەوە چۆن بەم شێوەیە پەرتەوازە بوون و ژیانیان بەرە و ناخۆشی چوو چونکە نامەی باوکەکەیان نەدەخوێندەوە و سوودیان لێنەبینی، بەڵکو هەر خەریکی بە پیرۆز کردنی نامەکان بوون و پارێزگاریان لێدەکرد بێ ئەوەی کاری پێبکەن.

پاشان سەیری قورئانی پیرۆزم کرد... ئەو قورئانەی کە لە نێو قوتوو یان بەرگێکی جوان لەسەر رەفەکان دانراوە.....ئایماڵی وێرانم!

مامەڵەی من بۆ قورئانی پیرۆز کە نامەی خودا گیانە هەمان ئەو مامەڵەیەیە یە

ئەم منداڵانە لەگەڵ نامەکانی باوکیان کردیان.

من قورئانەکەم لەسەر مێزەکەم داناوە، نایکەمەوە و وەك بەرنامەی ژیان سەیری نە

ناوەڕۆکەکەی وەرناگرم بەڵکو هەموو رۆژێك دەیسڕمەوە و لە شوێنی خۆی

دایدەنێمەوە!.

لەدوای ئەم چیرۆکە.....داوای لێخۆش بوونم لە خوای گەورە کرد و دەستم کرد بە

خوێندنەوە و تێڕامان لێی و بڕیارم داوە چیتر لێی دوور نەکەومەوە.

## له بەرووبوومەکانی چاکە کردن لەگەڵ دایک و باوک
## چیرۆکێکی راستەقینە

پیرە پیاوێک لەناوەندی هۆڵی ماڵەکەی خۆی دانیشتبوو، لە ناکاو یەکێک لە دەرگایانی دا......کوڕی ئەم پیاوە پیرە کە هێشتاکە ٢٧ ساڵانی تەواو نەکردبوو، خێرا دەرگاکەی کردەوە چونکە زۆر بەتوندی لە دەرگا دەدرا، لە ناکاو پیاوێکی چوار شانە، بێ سلاو کردن و وەرگرتنی مۆڵەت خۆی کرد بە ژوورەکەدا، یەکسەر بۆلای پیاوە پیرەکە چوو و یاخەی کراسەکەی گرت و پێی گوت:

لە خوا بترسە... ئەو قەرزەی لەسەرتە بیدەوە، مۆڵەتی زۆرم پێدای و ئێستاکەش تاقەتم نەماوە...... خۆ دەزانی چیت لێدەکەم پیرەمێرد؟

لێرەدا کوڕەکە نەیتوانی باوکی لەم دۆخە ناخۆشە ببینێت بۆیە، بە چاوی پڕ لە فرمێسکەوە رووی لە پیاوەکە کرد و گوتی: ببورە بەڕێز چەند پارەتان لای باوکمە؟

پیاوەکە: پتر لە ٩٠٠٠٠ ریال

گەنجەکە بە پیاوەکەی گوت: هێور بەوە و واز لە باوکم بێنە و فەرموو لێرە دانیشە، پشت بەخوا چ باشە ئەوەت بۆ دەکەین.

گەنجەکە چوە ژوورەکەی خۆی و ئەو بڕەپارەیەی کە پاشەکەوتی کردبوو بۆ ژن هێنان، دەریهێناو بڕیاریدا باوکەکەی لەم تەنگانەیە پێ رزگار بکات، بۆیە گەڕایەوە لای پیاوەکە و پێی گوت: ئەمە قستی یەکەمی قەرزەکەتە، بڕەکەی ٢٧٠٠٠ ریالە، تۆزێک سەبرمان لەسەر بگرە پشت بەخوا ئەوانی تریشت بە زووترین کات دەدەینەوە.

پیرە پیاوەکە زۆر بە کوڵ گریا، داوای لە پیاوەکە کرد پارەکە بگێڕێتەوە بۆ کوڕەکەی چونکە زۆر پێویستیەتی و ئەو هیچ تاوانی نیە لەم نێوەندەدا، بەڵام خاوەن قەرزەکە ئامادە نەبوو پارەکە بگێڕێتەوە و گەنجەکەش ئامادە نەبوو پارەکە وەربگرێتەوە، بە هێمنی پیاوەکەی تا بەر دەرگا بەڕێکرد وپێی گوت: ئەم مەسەلەیە داواکارم لە بەڕێزتان چیتر ڕێگە لە باوکم نەگرن، بەڵکو پەیوەندی بە منەوە بکەن و دەرگاکەی داخست.

کوڕەکە هاتە لای باوکی و نێو چەوانی ماچ کرد و گوتی: باوکە گیان قەدری تۆ لای ئێمە زۆر لەم پارەیە گەورە ترە... بگرە هەر بەراورد ناکرێت، خەم لە پارە مەخۆ، ئەگەر خودا تەمەنی دا و لەشمان ساغ بێت، ئەوا هەموو شتێك قەرەبوو دەبێتەوە، باوکە گیان چۆن دەتوانم بەرگەی ئەم وەزعە بگرم، بڕوام پێبکە ئەگەر هەموو پارەکەم هەبوایە ئەوا دڵنیابە هەر هەموویم دەدایەوە نەوەکو دانە فرمێسکێك لە چاوەکانت بەسەر ریشە پاك و خاوێنەکەت بێتە خوارەوە.

باوکەکە بەگریانێکی کوڵەوە کوڕەکەی لە باوەش گرت، ماچی کرد و گوتی: خودا لێت رازی بێت کوڕەکەم، سەرکەوتو و سەرفرازت بکات و هەموو ئاواتەکانت بێنێتە دی.

ڕۆژی دواتر کوڕەکە وەك ڕۆژانی تر چوە سەرکاری ئاسایی خۆی، لە ناکاو یەکێك لە هاوڕێکانی کە ماوەیەکی زۆر بوو نەبینیبوو هاتە ژوورەوە... دوای سڵاو کردن لە یەکتر و گلەیی کردن لە وەی کە بۆچی ئەم هەموو ماوەیە هەواڵی یەکتریان نەپرسیوە، یادی ڕۆژانی قوتابیەتیان بە یەکەوە کردەوە.

هاوڕێکەی پێی گوت، کارێکم پێتە براکەم

ئەویش گوتی: فەرموو بڵێ

هاوڕێکەی گوتی: دوێنێ لای یەکێك لە بازرگانە گەورەکان بووم، داوای لێکردم کەسێکی بۆ بدۆزمەوە دەست پاك و ڕەوشت بەرز و دڵسۆز بێت و توانای بەڕێوەبردنی کاری سەرکەوتووی هەبێت، منیش لە ڕاستیدا تۆم هاتەوە یاد و لە تۆم باشتر نەبینی کە شیاوی ئەم کارە بێت، جا نازانم ڕات چیە بەرامبەر ئەم کارە......؟ ئەگەر ڕازیت ئەوا هەڵسە هەر ئێستا دەست لەکار کێشانت پێشکەش بە فەرمانگەکەت بکە تا ئێوارە بچینە لای ئەم بازرگانە و گرێبەستی لەگەڵدا مۆر بکەیت.

کوڕە بەبیستنی ئەم هەواڵە گەشایەوە و گوتی: بەخوا ئەمە نزاکەی باوکمە خودا قبووڵی کردوە و سوپاسی خوای گەورەی کرد لەسەر ئەم چاکانەی کە لەگەڵی کردوون.

کە ئێوارە داهات کوڕەکە لەگەڵ هاوڕێکەی، لە کاتی دیاریکراودا چاویان بە بازرگانەکە کەوت، بازگانەکە سەیرێکی سەر و سیمای ئەم لاوەی کرد، یەکسەر گوتی ئەمە ئەو پیاوەیە کە بەشوێنیدا دەگەڕێم.

لێی پرسی: تۆ مووچەت چەندە؟

کوڕەکە: ٤٩٧٠ ڕیاڵ

بازرگانەکە: بەیانی دەستلەکار کێشانەوەکەت پێشکەش بکە و مووچەت لای من ١٥٠٠٠ڕیاڵ دەبێت و لە قازانجیشدا بڕی ١٠٪ پێدەدەم، ٣ مووچەت دەدەمێ لەبری گرتنی خانوو بۆت، جگە لە هەموو ئەمانەش نوێترین ئوتومبێلت بۆ دەکڕم تا هاتوو چۆی پێبکەی و مووچەی شەش مانگیشت پێشتر پێدەدەم تا باری گوزەرانت باش بکەی.

کوڕە بەرگەی ئەم هەواڵەی نەگرت، دەستی کرد بە گریان، هەموو سەریان سوڕما!
ئەمە لە جیاتی دڵی خۆش بێت، نەگریت!
پاشان کوڕەکە چیرۆکی خۆی بۆیان گێڕایەوە کە تووشی چی هاتووە و چۆن پارەکەی
خۆی بەخشی و چۆن باوکی نزای بۆ کردووە کە خوای گەورە دەووەی خێری
لێبکاتەوە.
چیرۆکی ئەم کوڕە زۆر کاری لە بازرگانەکە کرد، بۆیە یەکسەر بڕیاریدا قەرزەکەی
سەر باوکی بۆ بدەنەوە.
ئەوەی کە خوێنەرتانەوە بەرێزەکانم بەرهەمی باش بوونە لەگەڵ دایک و باوک.
چۆن نا مەگەر خوای گەورە ڕەزامەندی خۆی لە ڕەزامەندی دایک باوک داتەناوە؟!
ئەوەنیە دەفەرموێت: ﴿وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوٓا۟ إِلَّآ إِيَّاهُ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَـٰنًا ۚ
إِمَّا يَبْلُغَنَّ عِندَكَ ٱلْكِبَرَ أَحَدُهُمَآ أَوْ كِلَاهُمَا فَلَا تَقُل لَّهُمَآ أُفٍّ وَلَا
تَنْهَرْهُمَا وَقُل لَّهُمَا قَوْلًا كَرِيمًا ﴿٢٣﴾﴾ (الإسراء: ٢٣)
واتە: (ئەی مرۆڤ: پەروەردگارت بڕیاری داوە کە جگە لەو زاتە هیچ شتێکی تر
نەپەرستن، و فەرمانی داوە کە چاك ڕەفتار و جوان کردار بن لەگەڵ دایك و باوکتان،
خۆ ئەگەر یەکێکیان یان هەردووکیان لە تەمەنی پیریدا کەوتنە لای تۆ، ئەوە نابێت
تۆ ڕۆژێك لە ڕۆژان ئۆفیان لەدەست بکەیت، هەروەها نابێت لە هیچ حاڵەتێکدا
پەستیاندا هەڵشاخیت، بەڵکو هەمیشە قسەو گوفتارت لەگەڵیاندا چاك و جوان و
شیرین سۆزدار بێت.)
داوا لەخوا دەکەم کە خزمەتکردن و چاکە کردن لەگەڵ باوك و دایکمان پێببەخشێت و
لەسەر ئەم کارەش دامەزراومان بکات و ببینە مایەی خێر و خۆشی و شادی ئەوان.

## بکوژی خۆشەویستی

هەبوو نەبوو دوورگەیەك هەبوو، هەموو هەستەکان تێیدا دەژیان.....

رۆژێکیان بایەکی زۆر توند هەڵیکرد، خەریك بوو دوورگەکە نقوم بێت، هەموو هەستەکان جگە لە (خۆشەویستی) لە ترس و دڵەڕاوکێ دابوون، خۆیان خەریکی دروستکردنی بەلەمێك کرد بۆ خۆ قورتارکردن. دوای تەواو بوونی بەلەمەکە، گشت هەستەکان سواری بەلەمەکە بوون جگە لە یەکیان نەبێت، بۆیە (خۆشەویستی) بە ناچاری هاتە خوارەوە بۆ گەڕان بە شوێن ئەم هەستە وون بوە.

ئەم هەستەی کە ئامادەنەبوو لەگەڵیان بڕوات هەستی (سەرکێشی) بوو، (خۆشەویستی) زۆر هەوڵی لەگەڵدا......تکای لێکرد.....بەڵام بێهوودە بوو.

ئاوەکە بەرە بەرە بەرز دەبوویەوە، هەموو هەستەکان داوایان لە (خۆشەویستی) کرد خێرا بێتە ناو بەلەمەکە و رزگاریان بێت، بەڵام (خۆشەویستی) ئەمەی رەت کردەوە! چونکە (خۆشەویستی) بۆ ئەوە خولقاوە کە خۆش بویسترێت.......

هەموو هەستەکان هەڵاتن و رزگاریان بوو جگە لە (خۆشەویستی) نەبێت کە لەگەڵ (سەرکێشی) دا لەسەر دوورگەکە مانەوە و مردن.

بۆیە هەمیشە (سەرکێشی) خۆشەویستی دەکوژێت. باشە کەوایە ئەی بۆ (سەرکێشی) نەسرینەوە لە نێو لیستی هەستەکان؟ بۆ نەینێژین بەر لەوەی رێی خۆشەویستی بگرینە بەر...؟ نەخێر، با بە خۆشەویستی هەموو ئەوانە لەخۆمان بگرین کە خۆشمان دەوێن، و سەرکێشیش بۆ ئەوانە جێبێلین کە بەدوای خۆشەویستیدا ناگەڕێن.

# چیرۆکی دار خورما

لەو کاتەی کە پێغەمبەری خوا صەلات و سەلامی خوای لەسەر بێت لە نێو هاوەلانی لە مزگەوت دا دانیشتبوو.. گەنجێکی بێ باوك هاتە لایان... سلاوی کرد و رووی سکالای کردە پێغەمبەری خوا و گوتی:

ئەی پێغەمبەری خوا، دەستم کرد بە دروستکردنی دیوارێك بە دەوری باخچەکەم، بەلام کارەکەم وەستا بەهۆی دار خورمایەکی دراوسێکەم، داوام لێکرد پێمی بەخشێت تا بتوانم دیوارەکە تەواو بکەم بەلام ئەو رەتی کردەوە، ئەمجارەیان داوام لێکرد پێم بفرۆشێت، بەلام ئەو ئەمەشی رەت کردەوە.

پێغەمبەری خوا فەرمووی: دراوسێکەیم بۆ بانگ کەن.....

کاتێك دراوسێکە هات، پێغەمبەری خوا چیرۆکی گەنجەکەی بۆ گێرایەوە، دراوسێکەش ووتی تۆ راست دەکەی ئەی پێغەمبەری خوا، لێرەدا پێغەمبەری خوا داوای لێکرد ئەم دار خورمایەی پێببەخشێ یان پێی بفرۆشێت، بەلام ئەو جارێکی تر بەهیچ کامێکیان رازی نەبوو.

پێغەمبەری خوا دووبارە پێی گوت: ((دارخورماکەی پێبفرۆشە، لەبەهەشتدا دار خورمایەکت پێدەدەن سوار چاك سەد سالْ لە ژێر سێبەریا بڕوات))

هەموو هاوەلەکانی پێغەمبەر صەلات و سەلامی خوای لەسەر بێت واقیان وڕما لەوەی کە پێغەمبەری خوا بەم پیاوەی نیشاندا، ئاخر یەکێك لەم جۆرە دارخورمایەی هەبێت چۆن دەچێتە دۆزەخەوە؟ پێم نالێی دارخورمایەکی دونیا چ بەهایەکی هەیە بەرامبەر بە دارخورمای بەهەشت؟ بەلام مخابن تەماع ئەم پیاوەی گرتبوو، بۆیە ئەم پێشنیار و موژدەیەی پێغەمبەری رەت کردەوە و ئامادە نەبوو مامەلە لەسەر دارخورما کەی بکات.

لەم کاتەدا یەکێك لە هاوەڵان کە ناوی ئەبو دەحداح بوو ئامادەی ئەم مەجلیسە بوو و گوێی لە پێغەمبەر بوو سەلامی خوای لەسەر چ مژدەیەك و خەلاتێکی خوایی دا بەم پیاوە لە بەرامبەر فرۆشتنی ئەم دارخورمایە، لە پێغەمبەری دووبارە کردەوە و پرسی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەگەر من دارخورماکە بکڕم دارخورمایەکم پێدەدرێت لە بەهەشت؟

پێغەمبەری خوا فەرمووی: بەڵێ

ئەبو دەحداح گوتی: تۆ کابرا ئایا باغەکەی من دەناسیت....؟

دراوسێکە گوتی: (بەڵێ جا کەس هەیە باغەکەی ئەبو دەحداح نەناسێت، شەش سەد دارخورما و کۆشکی فراوان و بیری ئاوی سازگار و شورەی بڵندی چوار دەوری؟) هەموو بازرگانانی مەدینە لەبەر باشی بەرەکەی، چاویان لە خورمای ئەبو دەحداحە.

ئەبودەحداح گوتی: دەباشە تۆ دارخورماکەت بە من بفرۆشە منیش باغەکەم و کۆشکەکەم و بیرە ئاوەکەم و شورەکەیت پێدەفرۆشم؟

پیاوەکە بە سەرسوڕمانەوە سەیری پێغەمبەری خوای کرد.....ئەو باوەڕی بەوە نەکرد کە ئێستا بیستی.....باوەڕ ناکرێت.....شەش سەد دارخورمای ئەبو دەحداح بەرامبەر یەك دارخورما؟ ئەمە بە هەموو پێوەرێك بازرگانیەکی قازانج بەخشە...

پیاوەکە رازی بوو و پێغەمبەری خوا صەلات و سەلامی خوای لەسەر بێت لەگەڵ هاوەڵان شایەتی ئەم کڕین و فرۆشتنە بوون و گرێبەستەکە کرا.

ئەبو دەحداح بە دڵخۆشیەوە سەیرێکی پێغەمبەری خوای کرد و گوتی: من دارخورمایەکم هەیە لە بەهەشت، وانیە ئەی پێغەمبەری خوا؟

پێغەمبەری خوا صەلات و سەلامی خوای لەسەر بێت فەرمووی: نەخێر

ئەبو دەحداح واقی وڕما لە وەڵامەکەی پێغەمبەر صەلات و سەلامی خوای لەسەر بێت..

پێغەمبەری خوا قسەکانی خۆی تەواو کرد و فەرمووی: خوای گەورە دارخورمایەکی بەرامبەر بە دارخورمایەك دا بەڵام تۆ بە شەش سەد دارخورماکەت زیاد کردنت لەسەر بەخشندەیی خوای گەورە کرد، خوای گەورەش بەرامبەر ئەم بەخشندەییەت کە خۆی خاوەن بەخشندەیی یە لە بەهەشتدا هێندەی باغی خورمای بۆ ئامادە کردویت کە لە زۆریان لە هەژمار نایەت.

پێغەمبەری خوا صەلات و صەلات و سەلامی خوای لەسەر بێت فەرمووی: دەزانن چەند دارخورمای بەردار بۆ ئەبو دەحداحە؟ لەو ساتەوە پێغەمبەری خوا وەسفی دارخورماکانی بۆ ئەبو دەحداح کرد تا ئەو رادەیەی هاوەڵان سەریان سوڕما لە وەسفەکانی پێغەمبەر و ئاواتە خواز بوون کە ئەوان کڕیاری ئەم دارخورمایە بان و لە شوێنی ئەبو دەحداح بان!.

کاتێك ئەبو دەحداح گەڕایەوە ماڵی خۆی بانگی هاوسەرەکەی کردە دەرەوەی ماڵ و پێی گوت: من باغەکە و بیرەکە و کۆشکەکە و دیوارەکەم فرۆشتوە

هاوسەرەکەی ئەبوودەحداح رووی گەش بوویەوە لەگەڵ ئەم هەواڵە چونکە دەیزانی پیاوەکەی لە بازرگانیدا شارەزایە، خێزانەکەی گوتی بەچەندت فرۆشتوە باوکی دەحداح؟ ئەویش وەڵامی دایەوە و گوتی: بە دارخورمایەکم فرۆشتوە کە سوار چاك سەد ساڵ لە ژێر سێبەریدا دەڕوات...

هاوسەرەکەی پێیگوت: قازانجێکی گەورەت کردوە ئەبودەحداح – قازانجێکی گەورەت کردوە.

## چیرۆکی ژیریەك

### چیرۆکی یەکەم:

هاوولاتیەکی بەلجیکی بۆماوەی ۲۰ ساڵ رۆژانە بە پایسکلەکەی خەریکی پەڕینەوەی سنووری ئەڵمانیا بوو. لەکاتی پەڕینەوەی جانتایەکی پڕ خۆڵ دەکرد و بە کۆڵی دادەدا. پیاوانی سنووری ئەڵمانیا دڵنیا بوون لەوەی کە ئەم پیاوە شتێك ئاودیوی وولاتەکەیان دەکات بەڵام هەموو جارێك کە دەیانپشکنی جگە لە خۆڵەکە هیچی تریان نەدەدۆزیەوە.

نهێنی راستەقینە تەنها دوای کۆچی دوایی بەڕێز دیستان ئاشکرا بوو، کاتێك لە بیرەوەریەکانی ئەم رستەیەی نووسیبوو:....تەنانەت هاوسەرەکەشم نەیدەزانی من ئەو سامانەی کە پێکمناوە لە دەرەنجامی ئاودیو کردنی پایسکلەکان بوە بۆ ئەڵمانیا !.

رەگەزی ژیری لێرە بریتیە لە: خۆڵ کردن لە چاوەکان، و سەرنجی خەڵکان لەسەر ئامانجەکەت لابەریت.

### چیرۆکی دووەم:

لە حوزەیفەی کوڕی یەمان دەگێڕنەوە گوتی: لە شەڕی خەندەقدا، پێغەمبەری خوا صەلات و سەلامی خوای لەسەر بێت بانگی کردم و پێی گوتم: برۆ ناو سەربازگەی قورەیشیەکان و بزانە ئەوان چی دەکەن و چی دەڵێن، منیش لەسەر فەرمانی ئەو چوومە نێو سەربازگەکە... بارو دۆخەکە زۆر ناخۆش بوو (تۆز و بایەکی زۆر بەهێز

هەڵیکردبوو و کەس کەسی نەدەناسییەوە، لەو [illegible]
[illegible]
کۆمەڵی قورەیش، با هەریەک لە ئێوە سەیری تەنیشتەکەی خۆی بکات [illegible]
(نەوەکو نەناسراوی لێبێت)، حوزەیفە دەڵێت منیش خێرا دەستی [illegible]
گرت و لێم پرسی تۆ کێیت؟ تۆ کێیت؟ ئەویش شلەژاو گوتی من فڵانی کوڕی فڵانم!
رەگەزی ژیری لێرە بریتیە لە........خێرایی لە دەست پێشخەری و هەڵسوکەوت [illegible]
کردن بە متمانە بەخۆ بوونەوە بە شێوەیەک گومانت لەسەر لاببات.

## چیرۆکی سێیەم:

ئەبو حەنیفە بۆمانی گێڕایەوە و گوتی: جارێکیان کەوتمە بیابان و زۆر تینووم بوو، پیاوێك لە نزیکم تێپەڕی، مەشکەیەکی ئاوی پێبوو، منیش داوای تۆزێك ئاوم لێیکرد، بەڵام ئەو مکوڕ بوو لەسەر ئەوەی ئاوەکەم بە پێنج درهەم پێبفرۆشێت و منیش تەنها پێنج درهەمم پێبوو، ترسی ئەوەم هەبوو پارەم لێببڕێت، بەڵام لەبەر ئەوەی زۆر تینوو بووم ناچار بووم مەشکەکە بکڕم. ئاوم خواردەوە تا تینوویەتیم شکا، دوای ماوەیەك لە حەسانەوە نان وشتم دەرهێناو بەعەرەبەکەم گوت، ئەرێ براله هەندێك ئاردت ناوێ، ئەویش گوتی: بۆ نا بێنە با بیخۆین، منیش بڕێك ئاردی ووشکم پێیدا.
کابرا هێندەی ئارد خوارد تا تینوو بوو، ئینجا گوتی: ئەرێ براله قومێك ئاوم نادەیتێ؟ منیش گوتم بۆ نا: پەرداخی بە پێنج درهەمە!.
بەم جۆرە،پێنج درهەمەکەم بۆ گەڕایەوە و مەشکەکەش بوو بە هیخۆم.
رەگەزی ژیری لێرە...شاردنەوەی نیەت و دروستکردنی دۆخی سەرکەوتنە!

## چیرۆکی چوارەم:

جموجۆڵێکی زۆر ژیرانە نەبیلێکی فەرەنسی پێی هەڵسا.

رۆژێکیان بە پەرتاوی گەڕایەوە کۆشکەکەی، ئاسەواری دڵە راوکێ و شپرزەیی پێوە دیار بوو، هاوسەرەکەی لە هۆکاری ئەم دڵە راوکێیەی پرسی و ئەویش گوتی: مارکیز کاجیلسترۆ پێی گوتم کە تۆ خیانەتی هاوسەریم لێدەکەیت لەگەڵ نزیکترین هاوڕێکانم (ئەم مارکیزە لە سیحر و جادووگەری ناو بانگی دەرکرد بوو).

خێزانەکەی لە تووڕەییان هۆشی لای خۆی نەما و زللەیەکی لە هاوسەرەکەی دا...........

دوای ماوەیەك ژنەکە بە هێمنی بە هاوسەرەکەی گوتی: ئێستاکە وا تێگەیشتم کە باوەڕت بە قسەکانی نیە؟!

ئەویش گوتی: ئەڵبەتە باوەڕم بە قسەکانی نەکرد، بەلاّم ئەو هەڕەشەی ئەوەی لێکردم و گوتی ئەگەر قسەکانم راست بن ئەوا تۆ بەیانی کە لەخەو هەڵسایت دەبیت بە پشیلەیەکی رەش...!

رۆژی دواتر کاتێك خێزانەکەی لە خەو هەڵسا بینی پشیلەیەکی رەش لە تەنیشتی خەوتوە، ئیتر لە ترسانا هاواری لێهەڵسا و ژوورەکەی جێهێشت.

پاشان گەڕایەوە لای پشیلەکە و لە بەرامبەری چەمایەوە و و داوای لێبووردن و لێخۆش بوونی لێکرد!.

ئا لەم ساتەدا، هاوسەرەکەی بە شمشێری دەستیەوە. لەپشت پەردەی ژوورەکەوە هاتە دەرەوە و بەردو هاوسەرەکەی رۆیشت..........

رەگەزی ژیری لێرەدا بریتیە لە.....سوود وەرگرتن لە ئەفسانەی خەڵکان و ناراستەکردنی بەم شێوەیەی کە لە بەرژەوەندی تۆ دابێت ! ▯

## چیرۆکی پێنجەم:

هێندەی نەمابوو دادگا نوتق بە حوکمی لەسێدارەدان بەسەر ئەو پیاوە بسەپێنێت کە ژنەکەی خۆی کوشتبوو، ئەگەر چی تا ئەو ساتەش لاشەکەی نەدۆزرابوویەوە و هەموو ئەو بەڵگانەش بەردەست بوون کە پیاوەکە تۆمەتبار دەکات.

پارێزەری بکوژەکەش هەوڵی دەدا دەست بە پووشێکیش بگرێت لە پێناو رزگار کردنی راسپێرەکەی.....بۆیە بە قازیەکەی گوت:

با حوکمی لە سێدارەدان بەسەر ئەم بکوژە بدرێت!........پێویستە دەستەی دادگا دڵنیا بێت لەوەی کە تۆمەتبارەکە کوژراوەکەی کوشتوە.......

ئێستاکە، لە دەرگای ئەم دادگایەوە.......بەڵگەیەکی بەهێز دەردەکەوێت لەسەر بێتاوانی راسپێرەکەم ئەویش زیندوویەتی و هاتنە ژوورەوەی هاوسەرەکەیەتی.....!

لەگەڵ ئەم قسانە دەرگای دادگا کرایەوە، هەموو چاوەکانی ناو دادگاکە سەیری دەرگایان دەکرد و چاوەڕوانی هاتنە ژوورەوەی کوژراوەکە بوون.....

دوای چەند چرکەیەك لە بێدەنگی و چاوەڕوانی، کەس نەهاتە ژوورەوە....لێرەدا پارێزەرەکە گوتی:هەموو چاوەڕوانی هاتنە ژوورەوەی کوژراوەکەی دەکرد ئەمەش ئەوە دەسەلمێنێت کە ئێوە باوەڕی سەد لە سەد تان نیە کە راسپێرەکەم هاوسەرەکەی خۆی کوشتوە!

لێرەدا هۆڵی دادگا پڕ بوو لە دەنگە دەنگ و مقۆ مقۆ، و زۆر سەرسام بوون بە زیرەکی پارێزەرەکە...

قازیەکان جارێکی تر دەستیان کردەوە بە گفتو گۆ... بۆ دیاریکردنی دوا هەڵوێستیان

دوای کاتژمێرێك حوکمەکە دەرچوو.....

حوکمی لە سێدارەدان سەپێنرا بەسەر پیاوەکە لەبەر ئەوەی بەڵگەیەکی حاشا هەڵنەگر کەوتە دەست دادگا کە ئەم پیاوە تۆمەتبار دەکات بە کوشتنی هاوسەرەکەی!

دوای دەرچوونی بڕیاری دادگا، خەڵکەکە ئەم پرسیارەیان لا دروست بوو: چۆن ئەم بڕیارەتان دەرکرد؟

دادوەر وەڵامی دایەوە: کاتێك پارێزەرەکە، ئاماژەی بەوە کرد کە خێزانی بکوژەکە نەمردوە و لە ژیاندا ماوە و لەدەرگای دادگاوە دێتە ژوورەوە، هەموومان روومان لەدەرگاکە کرد و چاوەڕوان بووین ئەم ژنە بێتە ژوورەوە، جگە لە یەك کەس نەبێت کە سەیری دەرگای نەکرد، ئەویش بکوژەکە بوو.....هاوسەری کوژراوا چونکە باش دەیزانی کە خێزانەکەی مردووە و.........مردووش لە دونیادا جارێکی تر هەڵناستێتەوە.

# پیری شکۆدار و سەرنشینانی شەمەندەفەرەکە

چیرۆکی پیرەمێردی شکۆدار و سەرنشینانی شەمەندەفەرەکەتان بیستوە؟

ئەگەر نەتان بیستوە، با بەیەکەوە بیبیستین چونکە تایبەتە بە هەمووومان و گشتمان پێویستیمان پێیەتی و بۆی هەیە هەموومان تووشی هەمان بار ببینەوە.

لە یەکێک لە وێستگەکانی شەمەندەفەر، سەرنشینان هەموویان سواری شەمەندەفەری تایبەت بە گەشتەکەی خۆیان دەبوون... یەکێک لەو شەمەندەفەرانە فیکەی خۆی لێدا وەك ئاماژەیەك بۆ تەواو بوونی کات و جوولە کردن....

یەکێك لەو سەرنشینانە کە پیرەپیاوێکی شکۆدار بوو و بەهەمان شەمەندەفەر گەشتی دەکرد، کەمێك دوا کەوتبوو، بەڵام خۆشبەختانە لەگەڵ لێدانی فیکە سواری شەمەندەفەرەکە بوو و گەشتەکە دەستی پێکرد.

کاتێك ویستی شوێنێك بۆخۆی بکاتەوە تا پشوویەك بدات، هیچ شوێنێکی بەتاڵی نەدۆزیەوە.........! روو و فارگۆنی یەکەم چوو....بینی هەموو منداڵن و یاری دەکەن، سڵاوی لێکردن....ئەوانیش وەڵامی سڵاوەکەیان دایەوە و دڵیان خۆش بوو بە بینینی کەسێکی وا رووگەشی شکۆدار، پیرە پیاو داوای مۆڵەتی کرد دانیشی بدەن تا گەشتەکە تەواو دەبێت؟ منداڵەکانیش وەڵامیان دایەوە و گوتیان: هی وەك تۆ لەسەر سەری خۆمانی دادەنێین ! بەڵام ئێمەی منداڵ یاری دەکەین و هەڵ بەز و دابەز ئەکەین، ئەترسین نارەحەتیت بۆ دروست بکەین و نەتوانیت پشوو بدەیت و لەبەر تۆ ئێمەش نەتوانین به ئازادی یاری خۆمان بکەین.......بەڵام ئەگەر بچیتە فارگۆنی دووەم، ئەوا بە دڵنیاییەوە هەموویان پێشوازیت لێدەکەن.

پیری شکۆمەند هەڵسـاو چوو بۆ فارگۆنی دووەم، بینی ۳ گەنجی تێدایە، لە دوا قۆناغی دوا ناوەندین، سێگۆشە و بزمێریان پێبوو....خەریکی وەڵامدانەوەی پرسیارەکان بوون.

شێخی نوورانی سلاوی لێکردن،ئەوانیش وەلامی سلاوەکەیان دایەوە و گەش بوونەوە بە بینینی ئەم پیاوە گەورەیە و بەخێرهاتنیان کرد و دڵ خۆشی خۆیان دەربڕی بە بینینی....

شێخی نوورانی پرسیاری لێکردن ئاخۆ رێگەی دەدەن لەلایان بمێنێتەوە تا کۆتایی گەشتەکەیان؟ ئەوانیش گوتیان: شەرەفمەندیە بۆ ئێمە کەسێکی وەك بەرێزتان لای ئێمە بمێنێتەوە! بەلام مامە شێخ خۆت دەبینی ئێمە خەریکی خوێندن و سا و سەتا و یاساکانی ئەندازەین، هەندێك جاریش دەنگمان بەرز دەبێتەوە، ئەترسین بەم رەفتارانەمان تۆ بێزار بکەین و نەتوانیت بە باشی پشوو بدەیت! ئەمەش بۆی هەیە وامان لێبکات کە نەتوانین بە ویستی خۆمان بخوێنین! بە تایبەت کە ئێمە نزیکی تاقیکردنەوەی کۆتایی سالین....بۆ ناچیتە فارگۆنی سێیەم؟ بەخوا ئەوەی ئەم رووە نوورینەی تۆ ببینێت حەز بە دانیشتن لەگەڵ تۆ دەکات و رێگە نادات بڕۆیت؟ شێخ بە ناچاری ئەم گەنجانەشی جێهێشت و چوو بۆ لای فارگۆنی سێیەم.

لەم فارگۆنەدا، بینی گەنجێك لەگەڵ هاوسەرەکەی دانیشتوە و پێدەچێت لە مانگی هەنگوینی دابن..... قسەی خۆش و نەستەق.....پێکەنین و سوحبەتکردن.....هەستی پڕ لە خۆشەویستی و میهرەبانی............

پیری شکۆدار سلاوی لێکردن، و ئەوانیش سلاوەکەیان وەلامدایەوە و گوتیان بەخێر بێیت ئەی نێوچەوان رووناك....فەرموو.....شێخ داوای لێکردن مۆڵەتی پێبدەن تا کۆتایی گەشتەکە لایان بمێنێتەوە چونکە شوێن نیە پشووی لێبدات......ئەوانیش

گوتیان: هی وەك بەرێزتان ئێمە تامەزرۆی دانیشتنین لەگەڵی،بەلام! بەلام وەك خۆتان دەبینن، ئێمە تازە هاوسەرگیریمان کردوە و لە مانگی هەنگوینی داین.....کەشەکەمان رۆمانسیە و... گەنجانەیە...... دەترسین جەنابتان لەگەڵ ئێمە نەتوانن پشووی خۆتان بدەن و ئێمەش هەست بە شەرمێك بکەین لە دەربڕینی خۆشەویستی و هەستەکانمان، بڕوا بکە ئەوەی لەم شەمەندەفەرەیە حەز دەکات تۆ لەگەڵی بیت.......بۆ ناچیە فارگۆنەکەی تر؟

پیری شکۆمەند ئەمجارەیان رووی کردە فارگۆنی چوارەم....بینی دوو کەسی تێدایە، لە لە کۆتایی سیەکانی تەمەنیانن....کۆمەڵێك نەخشەی زەوی و زار و پڕۆژەیان لەبەردەستە و گفتوگۆ لەسەر ئەم زەوی و پڕۆژانە دەکەن و بیروو بۆچوونیان ئاڵو گۆڕ دەکرد دەربارەی دوارۆژی ئەم پڕۆژانە.

شێخ سلاوی لێکردن....ئەوانیش بە سەرسامیەوە وەلامی سلاوەکەیان دایەوە، وەك بڵێی پیاوی وا نوورانیان نەدیبێت و خێرا بەخێرهاتنی شێخی شکۆمەند یان کرد.

شێخ داوای مۆڵەتی مانەوەی لێکردن تا کۆتایی گەشتەکە.....ئەوانیش گوتیان ئەمە مایەی شەرەفمەندیە یەکێکی وەك ئێوە لامان بمێنێتەوە....بەرەکەت دەخاتە دانیشتنەکەمان، بەلام ئێمە سەرەتای بازرگانیکردن و ژیانی پیشەییمانە، دەترسین بە گفتۆگۆکانمان و سەرقاڵیمان تۆش بێزار بکەین و ئەم باسانەی ئێمە لەگەڵ بەرێزتان نەگونجێت و لە بری ئەوەی ببینە مایەی خۆشی بۆ جەنابتان، بێزارت بکەین و هێندەی تر ماندوو ببیت. بۆ ناچیە ئەم فارگۆنەی دوامان هەرچی لەوێیە تامەزرۆی دانیشتن دەبێت لەگەڵتدا................

بەم شێوەیە شێخ دانە دانە فارگۆنەکانی کرد تا گەیشتە دوا فارگۆنی شەمەندەفەرەکە.

كه چوه ژووره‌وه: بينى خێزانيكى تێدايه پێك هاتوه له دايك و باوك و منداڵه‌كانيان... له‌راستيدا هيچ شوێنێكى به‌تاڵ نه‌مابوو.شێخ سه‌لامى كرد و ئه‌وانيش وه‌ڵامى سه‌لامه‌كه‌يان دايه‌وه و گوتيان به‌خێربێيت ئه‌ى مامه پيره.....فه‌رموو وه‌ره ژووره‌وه.....

باوكه‌كه گوتى محمد رۆڵه هه‌سته له باوه‌شى احمدى برات دانيشه، ئه‌م جانتايانه لێره لابه‌رن و بيخه‌نه ئه‌ولاوه.....عبدالله تۆش هه‌سته برۆ بۆ باوه‌شى دايكت.......

ئينجا باوكه‌كه به شێخى گوت فه‌رموو دانيشه. ئه‌مه هه‌مووى رويدا بێئه‌وه‌ى شێخ داواى مۆڵه‌ت بكات.

له كۆتاييدا، شێخ دواى ماندوو بوونێكى زۆر شوێنێكى دۆزيه‌وه تيايدا بحه‌سێته‌وه. دواى ماوه‌يه‌ك له رۆيشتن، شه‌مه‌نده‌فه‌ره‌كه له يه‌كێك له وێستگه‌كان وه‌ستا.....فرۆشيارێك كه خواردنى ئاماده‌ى ده‌فرۆشت سه‌ركه‌وته ناو شه‌مه‌نده‌فه‌ره‌كه.........شێخى نوورانى بانگى كرد بێته لاى ئه‌وان و به خانه‌واده‌كه‌ى گوت: ئێوه ميوانى منن و چيتان پێخۆشه داواى بكه‌ن، ئه‌وانيش داوه‌ته‌كه‌يان قبووڵ كرد و ئه‌وه‌ى ئاره‌زوويان لێبوو خواردديان.....سه‌رنشينانى شه‌مه‌نده‌فه‌ره‌كه كه ئه‌مه‌يان بينى په‌شيمان بوونه‌وه له‌وه‌ى داڵده‌ى شێخيان نه‌دا له‌لاى خۆيان.

پاشان شه‌ربه‌ت فرۆش هاته سه‌ره‌وه... به‌هه‌مان شێوه، شێخ شه‌ربه‌تى بۆ هه‌موو خانه‌واده‌كه كرى و په‌رداخێك شه‌ربه‌تى پرته‌قاڵيشى بۆ خۆى داوا كرد.

ئاى خوايه....هه‌موو سه‌رنشينانى شه‌مه‌نده‌فه‌ره‌كه سه‌يرى ئه‌وانيان ده‌كرد و خۆزگه‌يان ده‌خواست ئه‌م پياوه له‌گه‌ڵ ئه‌وان با... په‌شيمانى دايگرتبوون..... هه‌ريه‌ك به ئه‌وى ترى ده‌گوت... وێستى له‌گه‌ڵمان دابنيشێت به‌ڵام...........

ئەمجارەیان رۆژنامە فرۆش سەرکەوت، شێخ بانگی کرد....داوای گۆڤاری (گوڵەکان ناواتی ئەم ئوممەتەن) ی کرد بۆ دایکەکە....و گۆڤاری (ببە بە بانگخواز) یشی بۆ باوکەکە کڕی و....گۆڤاری (بەچکەشێری باوەڕ) یش بۆ منداڵەکان، بۆخۆشی داوای رۆژنامەی (ئوممەتی ئیسلام) ی کرد... لەولاوەش پەشیمانی و ئاخ کێشان بە رووی سەرنشینانەوە دیار بوو کە چۆن ئەم هەموو دیاری و بەخششەیان لەدەست دا...

بەڵام ئەمە داخ و حەسرەتی گەورە نەبوو،و دواهەمین دیاریش نەبوو بۆ ئەم خانەوادە میهرەبانە....... کەشەمەندەفەرەکە گەیشتە شوێنی مەبەست، سەرنشینان واقیان وڕما لەو هەموو سەربازەی کە هاتوونەتە ناو وێستگەکە....تاجە گوڵینە و گوڵی رەنگاو رەنگ و جوانکاریەکان وێستگەکەیان نەخشاندبوو، کەس نەیدەزانی چی روودەدات و ئەم پێشوازیە بۆ کێیە. دوای وەستانی شەمەندەفەرەکە، ئەفسەرێك سەرکەوت و داوای لە سەرنشینان کرد کە لەشوێنی خۆیان بمێننەوە تا میوانی پاشا لە شەمەندەفەرەکە دادەبەزێت، چونکە پاشا خۆی هاتوە بۆ پێشوازیکردنی...؟!

هەموو چاوەڕوانی میوانی پاشا.....پیرە شکۆمەندەکە بوو......

کاتێك داوایان لێکرد لە شەمەندەفەرەکە دابەزێت، ئەو رەتی کردەوە بە تەنیا دابەزێت و داوای کرد ئەو خانەوادەیەی کە جێگەیان بۆ کردەوە لەگەڵیدا بن تا پاشا خۆی رێزیان لێبنێت.

پاشا داواکەی پیری شکۆداری قبووڵ کرد.......خانەوادەکە بۆماوەی ٣ رۆژ لە بەشی شاهانە پێشوازیان لێکرا....دیاری زۆر و سەیریان پێشکەشکرا و چێژی زۆریان بینی لە گەڕان بەنێو کۆشك و دیمەنە دڵڕفێنەکانی سەرسامی کردن.

لێرەدا هەموو سەرنشینانی ناو شەمەندەفەرەکە حەسرەت و پەشیمانی زۆر تریان چەشت... چونکە ئەوان ئەم هەموو شتە ناوازەیان لەدەستدا... لەم کاتا ئەشدا پەشیمانی داد نادات...

دوای ئەوەی چێژمان بینی لەم چیرۆکە، ئەوە ماوە پرسیارێکتان لێبکەم:

زانیتان ئەم پیاوە پیرە کێ یە؟

هەر لەسەرەتاوەش گوتم ئەم چیرۆکە تایبەتە بەهەموومان؟

دەزانم هەمووتان ئەم پیرەتان ناسی و زانیتان مەبەستم لەم چیرۆکە چی بوو...

شێخی نوورانی ئایینە.......

شەیتانی نەفرەتی، پەیمانی داوە کە گومڕامان بکات و خوای گەورەش ئەم پلانەی ئاشکرا کردوە و لە قورئاندا تۆماری کردوە: ﴿وَلَأُضِلَّنَّهُمْ وَلَأُمَنِّيَنَّهُمْ وَلَآمُرَنَّهُمْ فَلَيُبَتِّكُنَّ آذَانَ الْأَنْعَامِ وَلَآمُرَنَّهُمْ فَلَيُغَيِّرُنَّ خَلْقَ اللَّهِ ۚ وَمَن يَتَّخِذِ الشَّيْطَانَ وَلِيًّا مِّن دُونِ اللَّهِ فَقَدْ خَسِرَ خُسْرَانًا مُّبِينًا ﴿١١٩﴾﴾ (النساء: ١١٩)

ئیبلیس چاك دەزانێت ئەگەر بڵێت ئایین خراپە یان سوودی نیە، ئەوا سەرکەوتوو نابێت لە دوورخستنەوەمان لە ئایین و بەدڵنیاییەوە شکست دەخوات.......

ئەو لە دەرگای (ئەمڕۆ نا سبەی) دا لێمان هاتە ژوورەوە

ئای پابەند بوون بە ئایین چەند خۆش و جوانە......بەڵام ئەوانە هێشتاکە منداڵن با بەشی خۆیان لە یاری و گەم و گەپی خۆیان وەربگرن....بۆ بیانبەستینەوە... با تۆزێك گەورە بن،سبەی فێری ئایین پەروەریان دەکەین

چەند جوانە بە ئایینەوە پابەند بیت: بەڵام ئاخر ئەوانە هێشتاکە قوتابین و خەریکی خوێندنن.....خەریکی تاقیکردنەوە و ئەرکی ماڵەوەن.....سبەی کە تەواو بوون فێری ئایین دەبن و پابەند دەبن بە بنەماکانی.........

ئااااااه....ئێمە هێشتا لە مانگی هەنگوینین... ئایین پەروەری شتێکی زۆر جوانە.....با تۆزێك ژیانێکی خۆش بەسەر بەرین، کە بەیانی داهات پابەند دەبین بە ئایینەوە........

ئێمە هێشتا تازە لەسەرەتای خۆپێگەیاندنین....تازە قاچێکمان خستوەتە نێو دونیای بازرگانیکردن.....بەڵێن بێت ماوەیەکی تر گرنگی بە ئایینەکەم دەدەم و... پابەندیش دەبم پێی!؟

نازانین بەیانی دێت تا پابەند بوونمان بە ئایین رابگەیەنین... یان لەژێر گڵداین......!

(ئەمرۆ نا سبەی) دەردێکی کوشندەیە هەموومان لە کارەکانماندا بەدەستیەوە دەناڵێنین، باوەڕمان بەم پەندەیە کە دەڵێت: (کاری ئەمرۆ مەخەرە بەیانی) بەڵام کاریشی پێناکەین بۆیە لە بونیاتنانی دوارۆژمان شکست دێنین.....ئەمە لەدونیادا.....هەرچی رۆژی دواییشمانە......ئەوا تەمەن تێدەپەڕێت و ئێمەش هەر دەڵێین، سبەی ئەم کارە دەکەم.....با دەستم بەتاڵ بێت ئینجا دەیکەم......من هێشتا منداڵم با تۆزێك گەورە بم......من هێشتا گەنجم... با تۆزێك دونیا ببینم.......با کارێك بدۆزمەوە...با....با...با.....

# چۆن پیاوەکەت هەموو داواکاریەکانت بەجێدەهێنێت

خاوەنی ئەم چیرۆکە دەڵێت:

بەر لەماوەیەك سەردانی دەستەخوشكێكم كرد.....دوای چاك و چۆنی، قسەو باسمان كردەوە تا گەیشتینە سەر باسی ژیانی هاوسەری،ئەو زۆر لە هاوسەرەكەی خۆی رازی بوو، چونكە وەك ئەو دەیگوت، درێغی نیە لە دابینكردنی پێداویستیەكانی ماڵ سەرەڕای ئەوەی شوفێریشیان نیە بۆ جێبەجێكردنی ئەم پێداویستیانە.

دوای ماوەیەكی تر سەردانیم كردەوە،دوای گفتوو گۆیەكی زۆر هاتینە سەر باسی خواردن منیش داوام لێكرد پێكهاتەی ئەو كێكەم بۆ بنووسێتەوە كە لە سەردانی پێشتر خواردبووم، ئەویش گوتی زۆر باشە، ئەم چەكمەچەیەی لای خۆت راكێشە قەڵەمێك و دەفتەرێكی تێدایە دەریكە تا برەكانی لەسەر بنووسی.

كە دفتەرەكەم كردەوە بۆ ئەوەی لاپەرەیەكی سپی لێدەركەم، هەستم كرد ئەم دەفتەرە تایبەتە بە تۆمار كردنی پێداویستیەكانی ماڵ، ئەوەی سەرنجی راكێشام نووسینەوەی شتەكان بوو بە خەتێكی زۆر جوان و سەرنج راكێش:

لاپەرەیەكی ئەو دەفتەرەم خوێندەوە......زانیم بۆچی هاوسەری دەستەخوشكەكەم بێزاری دەرنابڕێت لە هێنانەوە و كرینی پێداویستیەكانی ماڵەوە. بزانن ئەو چۆن پێویستیەكانی بۆ نووسیوە:

پەنیرێكی سپی وەك دڵت.......

قەیماغ هەی قەیماغ...

شەكر... وەك خوێنت.....

تەماتە....وەك كولمەكانت...

هەنگوین.. حەیاتەكەم.....

زەعفەران... وەك رەنگی دڵت....

سابوونێك وەك خۆت ناسك....

شیكولاتە ئەی جوانێ..لەو كاتەدا لیستی پێداویستیەكانی خۆم بیركەوتەوە...

هێلكە – شەكر – شیری قوتوی منداڵانت لەبیر نەچێت – پێنج قوتوو ساس -

ئارد – برنج

سوێند بەخوا ئەم جۆرە داواكاریە بۆمن بنووسرایەوە یەك دانەیم نەدەكڕی.........

وا بزانم ئەمە تەنها شێوازی من نیە لەنووسینی داواكاریەكان، بەڵكو هی

زۆریەمانە.....

زۆر پێكەنیم لە شێوازە ناز بەخشەكەی دەستەخوشكەكەم! ئەو بینی من شت

دەخوێنمەوە و پێدەكەنم بۆیە گوتی: ئەوە بەچی پێدەكەنیت؟

گوتم: ئەم لاپەڕەیەم خوێندەوە.....ئەویش پێكەنی و گوتی (بۆی ببە بە ژن، بۆت

دەبێتە پیاو).

دوای گەڕانەوەم لەم سەردانیە.....چاوەڕێی هەلێك بووم تا منیش خۆم تاقی

بكەمەوە....بە پەرۆشەوە چاوەڕوانی جەژنی قوربانم دەكرد چونكە نزیكترین بۆنە

بوو، ویستم وەك دەستە خوشكەكەم و بۆ یەكەم جار شێوازی نووسینەوەی

پێداویستیەكان بگۆڕم، بۆیە لە پەڕێكدا لیستێكم بەم شێوەیە بۆ نووسیەوە:

خۆشەویستەكەم:

پیاز... بۆنی وەك بۆنی دەمت بێت...تەماتە....لە رەنگی چاوەكانت بێت.....

پەتاتە....وەك لووتت بێت...پەلكە مێو.....وەك گوێیەكانت بێت.....

دەسكی ماسیحە.....وەك باڵات بێت

لەبیرنەكەی....پێش جەژنە قوربانیەكمان بۆ بێنەوە.....بەقەد خۆت بێت...

دوا مەكەوە چونكە یادت دەكەم...خۆشم دەوێیت.

## پیاوە داناکە

ماوەیەك بوو شتێك دوودڵی کردبووم بۆیە بڕیارمدا بچمە لای دانایەك تا وەڵامێکم دەسکەوێت، لە لای دانیشتم و چاوەڕوانی ئەوە بووم دەرفەت بڕەخسێت تا پرسیارەکەی خۆمی لێبکەم. ئەو زۆر بە تێبینی بوو بۆیە دوای کەمێك دانیشتن پێی گوتم پرسیارەکەت بکە ڕۆڵە منیش پێم گوت:چ شتیك لە مرۆڤدا لەهەمووی سەرسام ترە؟

دانایەکە گوتی: مرۆڤەکان خۆیان.....! کاتێك کە منالّن بێزار دەبن لەم قۆناغەیان، پەلە دەکەن بۆ ئەوەی گەورە بن، هەر کە گەورەش بوون ئومێد دەخوازن بگەڕێنەوە دۆخی مندالّی.

مرۆڤەکان لە پێناو کۆکردنەوەی پارە تەندروستیان لەدەست دەدەن، پاشان هەمان پارە و بگرە زیاتریش خەرج دەکەنەوە بۆ گێڕانەوەی تەندروستیان.

بە دلّەڕاوکێوە بیر لە دوارۆژ دەکەنەوە، و ئێستایان لەبیر دەکەن، بەمەش نە لە ئێستادا دەژین نە لە دوارۆژ.

وا ژیان بەسەر دەبەن وەك بلّێی هەرگیز نامرن، کەچی هێندە سەیریش دەمرن وەك بلّێی هەرگیز نەژ یابن.........

دوای ئەم قسانە چەند چرکەیەك لە بێدەنگی تێپەڕی بیّ ئەوەی قسەیەك بکەین.......

دیسان لێم پرسی: ئەم وانانە چین کە پێویستە مرۆڤ لە ژیاندا فێری بێت؟

ئەو گوتی:

- فێری ئەوە بن کە توانای ئەوەیان نیە وا لەخەڵك بکەن خۆشیان بوێن، بەڵکو کار لەسەر ئەوە دەکەن چۆن خۆشەویست بن.
- خۆیان بە خەڵکی تر بەراورد نەکەن.
- فێری لێبوردەیی بن و لێخۆش بوون تاقی بکەنەوە.
- لەوە تێبگەن کە جاری وا هەیە لە چەند خولەکێك برینی زۆر قووڵ لە خۆشەویستانیان دروست دەکەن، بەڵام پێویستیان بە چەندین ساڵ دەبێت بۆ سارێژ کردنی ئەم برینە
- هەندێ کەس هەن ئەوانیان خۆش دەوێت، بەڵام نازانن چۆن ئەم هەست و خۆشەویستیە یان بۆ دەر برن.
- بۆی هەیە دووکەس سەیری یەك شت بکەن، بەڵام بەشێوەی جیاواز بیبینن.
- بەس نیە تەنها لە یەکتر ببورن، بەڵکو خۆشیان ببورن

لە راستیدا قسەکانی هەمووی حیکمەت بوون بۆیە بە ملکەچیەوە گوتم: سوپاست دەکەم و خواحافیزیم لێکرد.......

## رۆزی و ئەجەل

لە حەسەنی بەسریان پرسی نهێنی دونیا نەویستیت چی یە؟ ئەویش گوتی چوار شت:

کە زانیم کەسی تر کاری من ناکات ئەوا کارم پێی کرد

کە زانیم رۆزی من ناچێت بۆ کەسی تر ئیتر دڵنیا بووم لێی

کە زانیم خوای گەورە ئاگای لێمە، شەرمم کرد بە گوناهەوە بمبینێت

کە زانیم مردن چاوەڕوانمە، زادم ئامادە کرد بۆ دیداری خودا

ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم پیاوێکی خەمباری بینی و پێی گوت: ئەگەر پرسیاری سێ شتت لێبکەم وەڵامم دەدەیەوە؟

پیاوەکە گوتی: بەڵێ

ئیبراهیم پرسی: ئایا شتێك هەیە لەم گەردوونە بێ ویستی خوا بەڕێوە بچێت؟

پیاوەکە گوتی: نەخێر

ئیبراهیم پرسی: ئایا هیچ لەو رۆزیە کەم دەبێتەوە کە خوا بۆتی بڕیار داوە؟

پیاوەکە گوتی: نەخێر

ئیبراهیم پرسی: ئایا چرکەیەك لەو ژیانەی کە خوا بۆتی بڕیار داوە کەم دەبێتەوە؟

پیاوەکە گوتی: نەخێر

ئیبراهیم گوتی: ئەی بۆچی وا خەمباری؟

# سکالاَ کردن لەلای خوا

ئەحنەفی کوڕی قەیس گوتی ڕۆژێکیان ژانە سکێکی توندم گرت و چوومە خزمەت مامم و سکالاَی ژانە سکەکەم لای کرد، ئەویش لێم تووڕە بوو و گوتی: ئەوەی تووشت دەبێت هەرگیز لای کەس باسی مەکە، چونکە پیاوان بەگشتی دوو چینن: چینێکیان خەمبار دەبن کە تووشی ئەم بارە بوویت و ئەوەی تریش دوژمنە و پێی خۆشە.

ئەی برازاکەم...

سکالاَ لای کەسێکی وەك خۆت مەکە، ئەگەر هەمان دەردی تووش بوو وەك تۆ بەدەستیەوە بنالێنێت، بەڵکو ڕووی سکالاَکەت لای ئەو کەسە بکە کە تووشی کردویت، چونکە تەنها ئەوە دەتوانێت چارەسەرت بکات.

برازاکەم....

چل ساڵ دەبێت یەکێك لەو چاوانەم لەدەست داوە! نە چیا، نە دەشت و دەرم پێی بینیوە، تەنانەت لای هاوسەرەکەی خۆشم باسم نەکردوە.

یەکێك لە پیاو چاکان دەڵێت:

سەیرم دێت بەوانەی کە تووشی زیانێك بوونە و ئەم ئایەتە ناخوێنێتەوە: ﴿وَأَيُّوبَ إِذْ نَادَىٰ رَبَّهُۥٓ أَنِّى مَسَّنِىَ ٱلضُّرُّ وَأَنتَ أَرْحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴿٨٣﴾﴾ (الأنبياء: ٨٣)

واتە: پەروەردگارا من زیانم پێگەیشتوە و تۆش لەهەموو کەسێك میهرەبان تری، چونکە لەدوای ئەم ئایەتە خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿فَٱسْتَجَبْنَا لَهُۥ فَكَشَفْنَا مَا بِهِۦ مِن ضُرٍّۖ وَءَاتَيْنَٰهُ أَهْلَهُۥ وَمِثْلَهُم مَّعَهُمْ رَحْمَةً مِّنْ عِندِنَا وَذِكْرَىٰ لِلْعَٰبِدِينَ ﴿٨٤﴾﴾ (الأنبياء: ٨٤)

واتە: ئێمە وەڵامی نزاکەیمان دایەوە و ئەو زیانەی پێیگەیبوو لەسەریمان لابرد و چاکمان کردەوە.

➢ سەیرم بەو کەسەش دێت کە تووشی ناڕەحەتیەك بوە و ئەم ئایەتەی لەبیر کردوە کە دەفەرموێت: ﴿ وَذَا ٱلنُّونِ إِذ ذَّهَبَ مُغَٰضِبًا فَظَنَّ أَن لَّن نَّقْدِرَ عَلَيْهِ فَنَادَىٰ فِى ٱلظُّلُمَٰتِ أَن لَّآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنتَ سُبْحَٰنَكَ إِنِّى كُنتُ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٨٧﴾﴾ (الأنبياء: ٨٧)

واتە: پاکی و گەورەیی بۆ تۆ ئەی خودای تاك و تەنیا من لە ستەمکارەکان بووم، چونکە لە دوای ئەم ئایەتە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ فَٱسْتَجَبْنَا لَهُۥ وَنَجَّيْنَٰهُ مِنَ ٱلْغَمِّۚ وَكَذَٰلِكَ نُۨجِى ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٨٨﴾﴾ (الأنبياء: ٨٨)

واتە: ئێمە دوعاکەیمان گیرا کرد و لەم ناڕەحەتیە رزگارمان کرد، هەروەها باوەڕدارانیش رزگار دەکەین.

➢ سەیرم دێت بەوانەی کە ترسیان هەیە و ئەم ئایەتەیان لەبیر کردوە کە دەفەرموێت: ﴿ٱلَّذِينَ قَالَ لَهُمُ ٱلنَّاسُ إِنَّ ٱلنَّاسَ قَدْ جَمَعُوا۟ لَكُمْ فَٱخْشَوْهُمْ فَزَادَهُمْ إِيمَٰنًا وَقَالُوا۟ حَسْبُنَا ٱللَّهُ وَنِعْمَ ٱلْوَكِيلُ ﴿١٧٣﴾﴾ (آل عمران: ١٧٣)

واتە: ئێمە خوامان بەسە و باشترین راسپێردراوە کە داوای کۆمەکی پارێزگاری لێبکەین.

➢ چونکە لەدوای ئەم ئایەتە دەفەرموێت

﴿ فَٱنقَلَبُواْ بِنِعۡمَةٖ مِّنَ ٱللَّهِ وَفَضۡلٖ لَّمۡ يَمۡسَسۡهُمۡ سُوٓءٞ وَٱتَّبَعُواْ رِضۡوَٰنَ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ ذُو فَضۡلٍ عَظِيمٍ ﴿١٧٤﴾ ﴾ (ال عمران: ١٧٤)

واته:،خودا نیعمەت و چاکەی خۆی بەسەردا باراندن و ئەو ترسو بیمەی هەیان بوو بۆی وەرگێڕان بە خۆشی و هیچ ناخۆشیەك تووشیان نەبوو.

➤ سەیرم بەو کەسەش دێت کە پیلانیان لە دژی گێڕاوە و ئەم ئایەتەی لەبیر کردوە کە دەفەرموێت: ﴿فَسَتَذۡكُرُونَ مَآ أَقُولُ لَكُمۡۚ وَأُفَوِّضُ أَمۡرِيٓ إِلَى ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ بَصِيرُۢ بِٱلۡعِبَادِ ﴿٤٤﴾ ﴾ (غافر: ٤٤)

واته: من کارو باری خۆم ئەسپاردەی پەروەردگار دەکەم، خودا بینەری بەندەکانە، چونکە هەر لە دوای ئەم ئایەتە دەفەرموێت:

﴿فَوَقَىٰهُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِ مَا مَكَرُواْۖ وَحَاقَ بِـَٔالِ فِرۡعَوۡنَ سُوٓءُ ٱلۡعَذَابِ ﴿٤٥﴾ ﴾ (غافر: ٤٥)

واته: خودا لە خراپیەکانی مەکرو پیلانی ئەوانی پاراست

➤ سەیرم بەو کەسەش دێت کە خوای گەورە نیعمەتی بەسەردا باراندوە بەلاّم ترسی لەناو چوونی هەیە و ئەم ئایەتەی لەبیر کردوە کە دەفەرموێت: ﴿وَلَوۡلَآ إِذۡ دَخَلۡتَ جَنَّتَكَ قُلۡتَ مَا شَآءَ ٱللَّهُ لَا قُوَّةَ إِلَّا بِٱللَّهِۚ إِن تَرَنِ أَنَا۠ أَقَلَّ مِنكَ مَالٗا وَوَلَدٗا ﴿٣٩﴾ ﴾ (الكهف: ٣٩)

واته: تۆ کە چوویتە باخەکەتەوە بیتگوتبا (**ما شاء الله**) خوای گەروە چەند جوانی بۆ رازاندومەتەوە، هیچ هێز و توانایەك نیە بەبێ ویستی خوا هیچ بکات، بەتایبەت کە من دەبینی هێز و تواناو سامان و منداڵم بە قەدەر تۆ نیە (کەچی سوپاس بۆ خوا قەناعەت دەکەم بە زۆری دەزانم).

# راوچی و تورەکە بەردەکە

جارێك راوچییێك لەخەو هەڵساو ویستی ئەمجارە زووتر لەرۆژان بچێتە ناو ناو بۆ راوکردن. هەرچەندە دونیا تاریك بوو بەلاّم ئەو لەماڵەکەی خۆی دەرچوو و بەرە بەرە لە قەراغی دەریاکە نزیك دەبوویەوە، لەناکاو شتێك بەر پێیەکانی کەوت.......

سەیری کرد توورەکەیەکە پڕیەتی لەبەردی بچووك، توورەکەکەی هەڵگرتەوە و بەتەوەزەلی تۆڕەکەی لە تەنیشت خۆی دانا و چاوەڕوانی خۆر هەلاّتنی دەکرد.

شتێك نەبوو خۆی پێ خەریك بکات، بۆیە تورەکەکەی کردەوە و دانەیەك لە بەردەکانی ناو توورەکەکەی دەرهێناو فڕەیدا ناو دەریاکە... پاشان دانەیەکی تریشی دەرهێناو بەهەمان شێوەی یەکەم فڕیدایە ناو دەریاکە... بەردێکی تر و..........یەکێکی تر... تا خۆر دەهات و دونیا رووناك بووەوە...راوچیەکە یەك بەردی لە ناو دەستیدا مابوو، کەسەیری بەردەکەی ناو دەستی کرد حەپەسا و، باوەڕی بەخۆی نەکرد!.........ئەمە ئەڵماسە...ئەی خوایە ئەو یەك توورەکە ئەڵماسی هەڵگرتبووەوە.....! ئەی هاوار خوایە گیان ئەو یەك توورەکە ئەڵماسی فڕەدا ناو ئاوەکە....! ئیتر لە داخان دەستی کرد بە گریان و سەرزەنشت کردنی خۆی.....ئەو ساتەی لە توورەکەیەك کرد کە سەرتاپای ژیانی دەگۆڕی.......بەلاّم ئەو لە تاریکیدا هەمووی فڕەدایە نێو دەریا.

پێتان وانیە ئەم راوچیە هێشتاکە بەختێکی باشی هەیە؟

ئەو هێشتاکە ئەڵماسێکی لەدەستدا ماوە، خۆرەکە هەڵهات بەر لەوەی ئەمەشیان فڕە بداتە ناو دەریا......

ئەمەش تەنها بۆ بەخت گەورەکانە و هەر ئەوانیشن دەبێت رۆژ بۆیان هەڵبێت ئەگەر دوای ماوەیەکیش بێت. کەچی بەدبەخت و بێئومێدەکان بۆی هەیە هەرگیز خۆر لەلایان هەڵنەیەت.......هەموو ئەڵماسەکانی ژیان فڕەدەدەن چونکە وادەزانن تەنها بەردێکە و بەس.

❊❊❊❊❊❊❊❊❊❊❊❊❊❊❊

ژیان گەنجینەیەکەی شاراوەی گەورەیە...........بەڵام ئێمە جگە لە شاردنەوەی یان لە لەدەستدانی هیچی تر ناکەین هەتاکو بەر لەوەی بزانین ژیان چیە! زۆرێکمان گاڵتەمان بە ژیان کرد و بەکەم سەیرمان کرد....بۆیە ژیانمان بە فیڕۆ چوو و هێشتاکە نەمانتوانی شتە شاراوەکانی ناو ژیان و جوانی و دەوڵەمەندی بدۆزینەوە و تاقی بکەینەوە.

گرنگ نیە ئەو گەنجینەیەی وونت کردوە چەندە.....چونکە ئەگەر چرکەیەکیش لە ژیان مابیت ئەوە دەکرێت شتێك بکرێت......شتێ کبە نەمری دەمێنێتەوە....شتێك هەیە ئەنجام بدرێت....لەگەڕان بە نێو ژیاندا دواکەوتن نیە....بۆیە کەس هەست بە بێ ئومێدی ناکات......مەگەر بەهۆی نەزانین و تاریکی نەبێت، ئێمە گریمان ژیان بریتیە لە کۆمەڵە بەردێك، ئەوانەی بەم جۆرە ژیانیان گرتە بەر، بەشکست خواردن و دۆڕان رازی بوون بەر لەوەی هیچ جۆرە هەوڵێك یان تێکۆشانێك بدەن لە بیرکردنەوە و گەڕان و تێڕامان.
ژیان لە کۆمەڵێك بەرد و تۆپەڵە قوڕ پێك نەهاتوە، بەڵکو شتی شاراوە لە نێوان ئەمانەدا هەیە. ئەگەر تۆ خاوەن بینینێکی تیژ بیت، ئەواخۆری ژیانی ئەڵماسیت بۆ هەڵدێت و بە هیوایەکی نوێ ژیانت رووناك دەکەیەوە. ▯

# فەلسەفەیەك پێی سەرسام بووم

پرۆفیسۆرەکە هاتە ژوورەوە و هەندێك لە ئامرازەکانی فێرکردنی لەدەست بوو.

قوتابییەکان چاوەڕوانی وانە ووتنەوە بوون.....بەڵام مامۆستاکەیان قوتوویەکی شووشەیی بەتاڵی دەرهێناو.....دەستی کرد بە پڕ کردنەوەی قوتوەکە بە تۆپی گۆڵف و لە قوتابیانی پرسی: ئایا قوتوەکە پڕ بۆتەوە یان بەتاڵە؟

قوتابیان: هەموو کۆك بوون لەسەر ئەوەی کە بەڵێ پڕبۆتەوە.

ئەمجارەیان پرۆفیسۆرەکە سندووقێکی تری بچووکی دەرهێنا، هەندێك بەردی ووردی تێدابوو....بەردەکانی خستە نێو هەمان قوتوە شووشەکە و بەتوندی رایشەقاند تا بەردە بچووکەکان جێگەی خۆیان کردەوە لە نێو شووشەکە!

پرۆفیسۆرەکە دووبارە گوتی: ئایا شووشەکە پڕ بۆتەوە؟

قوتابیان: بەڵێ ئێستاکە پڕ بۆتەوە.

پرۆفیسۆر ئەمجارەیان سندووقێکی تری بچووکی هێنایە دەرەوە کە پڕ بوو لە خۆڵ و دەستی کرد بە پڕ کردنەوەی قوتوە شووشەکە بەم خۆڵە ت اشوێن نەما خۆڵی تێنەچێت، ئینجا سەیرێکی قوتابیەکانی کردوو پێی گوتن: ئایا قوتوەشووشەکە پڕ بۆتەوە یان نا؟

قوتابیان بەیەك دەنگ: بەڵێ....پڕ بۆتەوە.....

ئەمجارەیان پرۆفیسۆر بەدەم پێکەنینەوە فینجانێك قاوەی هێناو خستیە ناو قوتوە شووشەکەوە وەك ئاماژەیەك بۆ ئەوەی کە هێشتناکە شوێن ماوە......

قوتابیان دەستیان بە پێکەنین کرد چونکە لەو باوەڕەدا نەبوون ئەم شووشەیە هیچ شتێکی تر لەخۆی بگرێت....

دوای تەواو بوونی ئەم راهێنانە پرۆفیسۆر دەستی بە قسە کرد و گوتی: دەمەوێت چیرۆکی ئەم کردارە بزانن، قەتابیەکانیش بە پەرۆشەوە سەیری مامۆستاکەیان کرد تا نهێنی ئەم راهێنانە بزانن:

پرۆفیسۆر گوتی: ئزیزەکانم قوتوە شووشەکە بریتیە لە ژیانی ئێوە.....تۆپەکانی گۆلفیش بریتین لەو شتەپێویستەکانی ژیانتان وەك: ئایین، بەهاکان، رەوشت، خێزان، منداڵ، تەندروستی، هاوڕێ، ئەگەر هاتوو هەموو شتێکت لەدەست دا بەلاّم ئەم شتەپێویستانەت هەبوو ئەوا ژیانت دەمێنێت.......پڕە و جێگیرە.......بۆیە گرنگی بە تۆپەکانی گۆلف بدەن.

هەرچی بەردە بچووکوکانیشە، ئەوا بریتین لە شتە گرنگەکان، وەك: پیشە، ماڵ، ئوتومبێل.....

خۆلەکەش بریتیە لە شتەکانی تر یاخود با بلێین شتە سادە و لاوەکیەکانی ژیانت....

سەیرکەن ئەگەر ئێمە سەرەتا خۆلەکەمان لە قوتوە بکردایە، ئەوا شوێن بۆ هیچ کامێك لە تۆپی گۆلف و ووردە بەردەکان نەدەمایەوە و بۆی هەیە ئەمە لەژیانی ئێوە بەدی بکرێت....

ئەگەر ئێوە هێز و تواناکانتان خەرج کرد لە شتە لاوەکیان لە ژیانتاندا ئەوا شوێن بۆ شتە پێویست و گرنگەکان نامێنێت. بۆیە دەبێت زۆر ئاگادار بن، سەرەتا کار لەسەر شتە پێویستەکان.. دواتر گرنگەکان....پاشان شتە لاوەکیەکان بکەن، تا ژیانتان جێگیر بێت.

قوتابیان بە ووردی گوێیان لەپرۆفیسۆرەکەیان گرتبوو و سەرنجی بە تەواوی ڕاکێشابوون،ئەویش بەردەوام بوو لە قسەکانی و گوتی: ئامۆژگاریم بۆ هەر یەکێتان ئەوەیە: ئاگاداری پەیوەندیت بە ئایینەکەت توند و تۆڵ بکە،.. دەست بە بەهاو باوەڕو ڕەوشتی بەرز بگرە....دیاری پێشکەشی هاوبەشی ژیانت بکە و بەردەوام خۆشەویستی و موحیببەتی خۆتی بۆ دەربڕە.....سەردانی هاوڕێکانت بکە و بەردەوام پرسیاریان بکە. هەندێك کاتیش تەرخان بکە بۆ ئەنجامدانی پشکنینی پزیشکی و باوەڕت بەوە هەبێت کە بەردەوام کات هەیە بۆ بەجێگەیاندنی کارەکانی تر..............

لە بیرتان نەچێت بۆ هەمیشە.........

گرنگی بە تۆپەکانی گۆلف بدە....چونکە ئەوان شایەنی گرنگی پێدانن.......

ئەولەویاتی ژیانت دیاری بکە....چونکە ئەوانی تر......تەنها خۆڵن...

کاتێك پرۆفیسۆر لە قسەکانی تەواو بوو....یەکێك لە قوتابیان دەستی بڵند کرد و گوتی:

دەکرێت پێمان بڵێی قاوەکە مانای چی دەگەیاند؟ چونکە تۆ باسی قاوەکەت بۆ نەکردین؟

پرۆفیسۆر پێکەنی و گوتی: خۆشحاڵ بووم بە پرسیارەکەت....

من قاوەکەم بەسەر هەموو شتەکان داکرد تا ئەوەتان بۆ روون بکەمەوە کە......

هەرچەندە ژیانت پڕ بێت لە مەشغەڵەت.. ئەوا هەمیشە ئەوەندە کاتەت هەیە بۆ فینجانێك قاوە....

## سەیرکردنی قێزمونانە

کچێك لەگەڵ دەسگیرانەکەی بڕیار بوو لە قاوەخانەیەك یەکتر ببینن. کچەکە بەر لە دەسگیرانەکەی گەیشت و لە شوێنێك بۆخۆی دانیشت و داوای چایەکی لە گارسۆنەکە کرد و دەستی کرد بە چا خواردنەوە.....

ناو قاوەخانەکە زۆر جوان دروست کرابوو، لەگەڵ مۆسیقاکە کەشێکی ئارامی بۆ دانیشتوان فەراهەم کردبوو گوڵە جوانەکان وای لەم کچە کرد بەدەم چا خواردنەوەکەی سەیری ناو قاوەخانەکە بکات. لەکاتی سەیرکردنی شتەکان بینی گەنجێك سەیری دەکات و بزە خەنەیەکی بۆ کرد! کچەکە بەم ڕەفتارە تۆزێك قەڵس بوویەلاّم هیچ گرنگیەکی پێنەدا و بەردەوام بوو لە چا خواردنەوەکەی.

کچەکە هەستی کرد ئەم کوڕە بەردەوامە لە سەیر کردنی و بزەخەنەی بۆ دەکات، بۆیە بڕیاری دا هەر کە دەسگیرانەکەی هات باسی مەسەلەکەی بۆ بکات و بیکات بە پەند بۆ هەموو ئەوانەی وەك ئەو ڕەفتار دەکەن و ڕێز لە ئازادی و حورمەتی خەڵك ناگرن.

لەو کاتەی کچە لەم خەیاڵاتە بوو دەسگیرانەکەی گەیشت، دوای سڵاو کردن لە یەکتری و پرسینی هەواڵی یەکتر کورە کە هەستی کرد شتێك هەیە بەلاّم ئەو نایزانێت بۆیە پرسیاری ئەوی کرد ئاخۆ شتێکی نا ئاسایی هەیە؟ کچەکەش ڕەفتاری ناشیرینی ئەو کوڕەی بۆ کرد..

دەسگیرانی کچە زۆر تووڕە بوو بۆیە هەڵساو بەرە و کوڕەکە ڕۆیشت، دەستی بڵند کرد و مستێکی بەهێزی لێدا و بە زەوی دادا، کچەکە زۆر بە شانازی و

سەرسامیەوە سەیری پیاوەتی و ئازایەتی دەسگیرانەکەی کرد و پاشان قۆڵی لەناو قۆڵی نا و لە قاوەخانەکە دەرچوون.

دوای چەند چرکەیەك کورەکە بە هاوکاری گارسۆنێك هەڵسایەوە و بەدوای گۆچانەکەی گەڕا تا دۆزیەوە، بە هێمنی رێگاکەی پێشخۆی بە گۆچانەکە پشکنی و لە قاوەخانەکە دەرچوو..!

# ئەو شوێنەی هەموو خەڵك رووی تێدەكات

بڕیاریدا بۆ جاری یەكەم چێژی حەرام تاقی بكاتەوە، سواری ئەو فڕۆكەیە بوو كە دەیبات بۆ ئەو شارەی كە بەچێژە جۆراوجۆرەكانی بەناوبانگە.

لە فڕۆكە خانە دابەزی و تەكسیەكی گرت و چاوی لە شوفێرەكە نوقاند و گوتی: بمبە ئەو شوێنەی كە هەموو خەڵك رووی تێدەكات و سەری بە كوشنی ئوتومبێلەكە دادا تا كەمێك بحەسێتەوە.

ئەو بیری لە مەیخانەكان و شەوە سوورەكان دەكردەوە، بیری لای ئەو ئافرەتانە بوو كە تەنها لە تەلەفزیۆن و رووی لاپەڕەكان بینیویانیەتی، خەیاڵی لای ئەوساتانە بوو كە لەگەڵ ئەم كەسانە بەسەری دەبات. دوای ماوەیەك لە رۆیشتن، ئۆتومبێلەكە لە ناكاو وەستا ئەویش سەیرێكی دەورو بەری كرد.... بینی شوێنەكە زۆر سەیر و نامۆیە....! ئەمە هەرگیز لەگەڵ پێشبینیەكانی تێك ناكاتەوە! ئاخر ئەو بە خەیاڵی ئوتێلی چوار ئەستێرە و ئافرەتی شۆخ و شەنگەوە هاتوە، كەچی ئێستا لەبەردەم دەرگایەكی سەیر وەستاوە!

لە شوفێرەكەی پرسی: ئێمە لەكوێین؟

شوفێرەكە بە ساردی وەڵامی دایەوە: گۆڕستانی شار!

بەتووڕەییەوە هاواری لەسەر شوفێرەكە كردوو پێی گوت: من دەمەوێت بچمە شوێنی شەوانە و یانەكان، نەك گۆڕستان!

شوفێرەكەش گوتی: بەڵام یانە و شوێنی شەوانە هەموو كەس رووی تێناكات، كەچی هەموو خەڵك، بەبێ جیاوازی دێنە گۆڕستان.......مەگەر خۆت نەتگوت بمبە بۆ ئەو شوێنەی كە هەموو خەڵك رووی تێدەكات؟.

# شۆخ و شەنگەکە

لە باخچەیەکی گشتیدا دانیشتبوو سەیری خەلکەکەی دەکرد چیدەکەن و چۆن دەجوولێنەوە... هێندێك یاریان دەکرد و هێندێکیش خوێندنەوە....یەکێکیش لەو سەرەوە لەبەر زۆر دانیشتن بێزار ی دایگرتبوو وخەوە کوتکە دەیبردەوە........!

لەدوورەوە ژنێکی شۆخ و شەنگی بینی، وەك تاووس دەڕۆیشت.....

ڕۆیشتنی ئەم ئافرەتە زۆر کاری تێکرد، بۆیە ویستی لەدڵی خۆیدا بەراوردێکی خێرا لەنیوان ڕۆیشتنی ئەم ئافرەتە و هاوسەرەکەی خۆی بکات کە وەك ڕۆیشتنی سەرباز وایە! لە راستیدا بەراوردەکە نەدەکرا چونکە هەستی کرد جیاوازیەکی زۆر لە نێوان ئەم دوو ڕۆیشتنەدا هەیە.

خەیالّی ئەو پیاوە زۆر دوور ڕۆیشتبوو بە شێوەیەك ئاگای لە دەورو بەری خۆی نەمابوو، لەو لاشەوە ئافرەتەکە پەیتا پەیتا لێی نزیك دەبوویەوە....! پیاوەکە بینی منداڵێك لە تەنیشت ئەم ئافرەتە دەڕوات، بۆیە لە دڵی خۆیدا گوتی: یاخوا پیرۆزی هاوسەرەکەت بیت ئەم پیاوە شانسێکی گەورەی هەیە، ژنێکی شۆخ و منداڵێکی جوان

تا دەهات ژنەکە نزیکتر دەبوویەوە،کەچی ئەو لەم دونیایە هەر نەمابوو! لە ناکاو بینی ژنەکە گەیشتە بەردەمی....ئەو ئارەقەیەکی زۆری کرد و شەرمێکی زۆر گەورە دایگرت....

چونکە بۆی دەرکەوت ئەم ژنە شۆخ و شەنگە....هاوسەرەکەی خۆیەتی و منداڵەکەی تەنیشتیشی.....کوڕەکەی خۆیەتی.

# ژیانی نموونەیی

دوای عەسر بوو، بڕیاریدا سەردانی دەستە خوشکەکەی بکات چونکە لەوەتەی شووی کردوە سەردانی نەکردوە. ئەو لەگەڵ هاوسەرە بازرگانەکەی لە ڤیللایەکی گەورە دەژین. دوای بەخێر هێنان و هەواڵ پرسین قسەو باس هاتە سەر ژیانی هاوسەری، ئەو پرسیاری ژیانی نوێی دەستەخوشکەکەی کرد، ئەویش باسی بەختە گەورەکەی خۆی کرد بە زەماوەند کردنی لەگەڵ هاوسەرە بازرگانەکەی.

بۆی دەگێڕایەوە کە چۆن هاوسەرەکەی ژیانێکی پادشاهانەی پێبەخشیوە، ماڵێك وەك کۆشك، خزمەتکار، پارە و بازاڕکردن، گەشت بۆ دەرەوەی وولات......

میوانەکە، چاویلکەیەکی رەشی لەچاو کردبوو و بە هێمنی گوێی لە قسەکانی ئەم هاوڕێیەی خۆی گرتبوو، چۆن باسی باشی پیاوەکەی خۆی و هۆکارەکانی شاد بوونیان دەکات، ئەویش لە ناخا ئومێدی ژیانێکی لەم شێوەی دەکرد.

حەسرەتەکانی وەلا ناو چاویلکەکەی لە چاوی کردەوە.....ئاسەواری لێدان و ماکە رەشەکان لە ژێر چاوەکانیدا دەرکەوتبوون.......

دەبێت بزانین کە ژیان هەمیشە.....بەم شێوەیە هەمووی خۆشی نیە! بەلکو ناخۆشیشی تێدایە.

# بەر لەوەی کارێك بکەی.. بیرکەوە

دەگێڕنەوە جارێکیان یەکێك لە پاشاکان بڕیاریدا گەشتێك بە نێو پایتەختەکەی خۆی بکات بەڵام بێنەوەی بیناسنەوە، جلەکانی خۆی گۆڕی و جلی بازرگانێکی پۆشی و بە نێو بازاڕە کۆنەکەدا دەسووڕایەوە. لە کاتی سوڕانەوەی بەنێو ئەم بازاڕەدا تێبینی دوکانێکی کۆنی کرد شتێکی وای تێدا نەبوو سەرنجی خەڵك بۆخۆی رابکێشێت ! ئەم دوکانە شتێکی وای تێدانە بوو....کە زیاتر نزیك بوویەوە بینی پیاوێکی زۆر پیر لەسەر کورسیەکی زۆر شڕۆڵە دانیشتوە، جگە لە چەند تابلۆیەکی کۆن لە ناو دوکانەکە هیچ شتێکی تر نەبوو سەرنجی پاشا رابکێشێت، بۆیە ویستی نهێنی ئەم مەسەلەیە بزانێت.....

پاشا سلاوی لە مامە پیرە هێمنەکە کردو ئەویش بە شێوەیەکی جوانتر و بە متمانە بەخۆبوونێکی گەورەوە وەلامی سلاوەکەی دایەوە...

پاشا گوتی: من هاتوومەتە ناو بازاڕ شت بکڕم....ئێوە چیتان هەیە بۆ فرۆشتن؟

پیرە پیاو بە متمانەوە گوتی: باشترین و گران بەهاترین شتی ئەم بازاڕەمان لایە!

ئەو ئەمانەی گوت بێنەوەی هیچ نیشانەیەکی گاڵتە کردنی لێدەرکەوێت!

پاشا بزەخەنەیەکی کرد و گوتی: بەڕاستیتە؟

پیرە پیاو: بەڵێ بەڕاستمە، کالاکانی من بەهایان زۆر گرانە،بەڵام کالاکانی بازاڕ بڕێکی دیاریکراویان هەیە و لەم بڕە تێپەڕ ناکەن.....

پاشا لە قسەکان و متمانەی ئەم پیرە پیاوە سەری سوڕما.....تۆزێك بێدەنگ بوو و جارێکی تر چاوی بەنێو دوکانەکەدا خشاند و... دووبارە گوتی: بەڵام من شتێك لە دوکانەت نابینم بۆ فرۆشتن بێت؟

پیرەپیاوەکە گوتی: من دانایی دەفرۆشم.....زۆریشم لێی فرۆشتوە و کڕیارەکانیشم سوودی زۆریان لێبینیوە..............! ئێستاش تەنها دوو تابلۆم لا ماوە.....

پاشا گوتی: هیچ قازانجت کردوە لەم بازرگانیە.......؟

پیرە پیاو بە پێکەنینەوە گوتی: بەڵێ گەورەم... من قازانجی زۆر دەکەم، چونکە تابلۆکانم زۆر گران بەهان........!

پاشا لە تابلۆکان نزیك بوویەوە و تۆزی لەسەر یەکێکیان لابرد،لەسەری نووسرابوو: بیر بکەوە بەر لەوەی کار بکەیت............

پاشا زۆر بیری لەم قسەیە کردەوە، پاشان ئاوڕی لی پیرە پیاوەکە دایەوە و گوتی: ئەم تابلۆیە بە چەند دەفرۆشیت؟!

پیرە پیاو بەهێمنیەوە گوتی: بە ١٠٠٠٠ دینار!

لێرەدا پاشا زۆر پێکەنی تا چاوەکانی پڕ بوون لە فرمێسك،کەچی پیرەپیاوەکە هەر لەسەر ئارامی خۆی مایەوە وەك بڵێی هیچی نەگوتبێت، ئەو زۆر بە شانازیەوە سەیری تابلۆکەی خۆی دەکرد........

پاشا گوتی: دەهەزار دینار؟! تۆ بە راستیتە!

پیرە پیاو گوتی: بەڵێ هیچ مامەڵەشی تێدا نیە

پاشا لەپێداگرتنی ئەم پیرەمێردە جگە لە سەر سوڕمان و پێکەنین هیچ مانایەکی تری نەدۆزیەوە،بۆیە وای مەزەندە کرد کە ئەم پیرە پیاوە ئەقڵی تێکچوویێت، بۆیە بەردەوام بوو لە مامەڵە کردن لەسەر نرخی تابلۆکە، هەر بۆیەش ئاماژەی بەوەدا کە ئەو تابلۆکە بە ١٠٠٠ دینار دەکڕێت بەڵام پیاوەکە رەتی کردەوە.

پاشا نرخەکەی بەرز کردەوە بۆ سێ هەزار.....پاشان چوار هەزار... تا گەیشتە نۆ هەزار.. کەچی پیرەمێرد هەر سوور بوو لەسەر ئەو نرخەی که لەسەرەتادا گوتبووی.

پاشا پێکەنی و بڕیاریدا لە دوکانەکە بێتە دەرەوە و لەو بڕوایە دابوو کە مامە پیرە بانگی دەکاتەوە و بە نرخێکی هەرزانتر پێی دەدات، بەڵام پیرەپیاو جارێکی تر لەسەر کورسیە شڕۆڵەکەی خۆی بە هێمنی دانیشتەوە و هیچ گرنگی نەدا بە رۆیشتنی ئەو.

لەو کاتەی کە پاشا بە نێو بازاڕدا دەسووڕایەوە، ویستی شتێك ئەنجام بدات کە مەردایەتی قبووڵی ناکات، بەڵام ئەو حیکمەتەی بیرکەوتەوە کە دەڵێت (بەر لەوەی کارێك بکەیت.. بیرکەوە) بڕیە یەکسەر لەم کارەی پاشگەز بوویەوە و! دڵی کرایەوە... ئەو بیری لەم حیکمەتە کردەوە و دانی بەوە نا کە سوودی لەم حیکمەتە بینی، بیری لەوە کردەوە کە شتی تریش هەن ژیانی لێناخۆش دەکەن ئەگەر ئەو ئەنجامیان بدات بێ بیر کردنەوە.

پاشا بەڕاکردن بەشوێن دوکانی پیر پیاوەکە دا دەگەڕا تا دۆزیەوە ! جارێکی تر سڵاوی کردەوە و گوتی: من بڕیارم دا ئەم تابلۆیەت لێبکڕم بە نرخەکەی خۆی.

پیرەپیاو لەسەر کورسیەکەی هەڵسایەوە و دەستی دایە پارچە پەڕۆکێکی کۆن تۆزی سەر تابلۆکەی بە تەواوی سڕیەوە، ئینجا تابلۆیەکەی دا بە پاشا.

پاش ئەوەی پیرەپیاوە داناکە هەموو پارەکەی وەرگرت بە پاشای گوت: من ئەم تابلۆیەم پێت فرۆشتوە بە یەك مەرج!

پاشا گوتی: فەرموو بڵێ....

دەبێت ئەم حیکمەتە لەسەر دەرگای کۆشکەکەت، زۆترین شوێن لەماڵەکەت، تەنانەت لەسەر ئەو کارەستانەی کە بەکاریشیان دێنیت، هەتاکو لە ناوکۆشکی حوکمڕانیشت بنووسیت پاشا ئەختێك بیری کردەوە و گوتی: رازیم بە مەرجەکەت!.

پاشا گەڕشایەوە کۆشك....بڕیاریدا پابەند بێت بە بەڵێنەکەی، بۆیە هەر لەدەگای کۆشکی حەوانەوەی تا دەگاتە شوێنە تایبەت و هەستیارەکان ئەم حیکمەتەی تێدا نووسیەوە تەنانەت لەسەر جل و بەرگی خۆی و ئەندامانی خانەوادەکەشی.

چەندین ساڵ بەسەر ژیانی ئەم پاشایە تێپەڕی بێ ئەوەی گرفتێکی بێتە پێش، تەماعی دونیاو پلە و پایە وای لە سوپا سالاری وولآت کرد پلانێك دابڕێژێت بۆ لەناو بردنی پاشاو خۆی شوێنی بگرێتەوە و ببێت بە پاشای وولآت، بۆیە پلانێکی وۆر گلاوی داناو بڕیاریدا پاشا بکوژێت لە ڕێی سەرتاشەکەیەوە. سوپا سالار ویژدانی سەرتاشەکەی بە بڕە پارەیەکی یەکجار زۆر کڕی و ڕێککەوتن لەسەر ئەوەی، کاتێك سەرتاش ریشی پاشا دەتاشێت چەقۆیەك بە ملی دابێنێت و بەمەش پاشا دەمرێت و سوپا سالاریش دەبێتەپاشای وولآت.

هەموو چاوەڕێی ڕۆژی سەرتاشینی پاشا بوون، کە ئەو ڕۆژە هات، سەرتاش زۆر بەهێمنی و متمانە بەخۆ بوونەوە بەرەو کۆشکی پاشا بەڕێکەوت، کە ویستی بێتە ژوورەوە سەیری کرد لەسەر دەرگا نووسراوە (بەر لەوەی کارێك بکەیت... بیری لێبکەوە)!....

ئەم دێڕە جۆرە شپرزەیی یەکی بۆ سەرتاشەکە دروست کرد، بەڵام ئەو دانی بەخۆی گرت و زۆر بیری لەم دێڕە نووسینە نەکردەوە. کە هاتە ژوورەوە بینی هەر لەسەرەتای ڕێڕەوەکە تا کۆتاییەکەی چەندین جار نووسراوە (بەر لەوەی کارێك بکەیت... بیری لێبکەوە) - (بەر لەوەی کارێك بکەیت... بیری لێبکەوە) - (بەر

لەوەی کارێك بکەیت... بیری لێبکەوە)، ئەم نووسینە ئەمجارەیان شتێکی لای سەرتاشەکە دروست کرد......بۆیە ئەختێك شلەژانی لێدەرکەوت و ترس دایگرت.
سەرتاش بڕیاری دا چیتر سەیری پێشەخۆی نەکات بەڵکو تەنها سەیری زەوی بەرپێیەکانی خۆی بکات، دوای کەمێك لە ڕۆیشتن بینی هەمان نووسین لەسەر زەوی نووسراوە، بۆیە هێندەی تر ترس و بیم دایگرت، هەوڵی دا دان بەخۆیدا بگرێت و ئەم دڵە ڕاوکێ و شلە ژانەی خۆی بشارێتەوە، بۆیە هەنگاوەکانی خێراتر کرد تا زوو بگاتە هۆڵی سەرتاشینەکە و ئەم نووسینە کاری تێنەکات.
هەرکە گەیشتنە ناو هۆڵەکە هەستی بە ئارامیەك کرد چونکە پێی وابوو ڕزگاری بوە لە کاریگەری ئەم نووسینە....
بەلاّم ئەوەی سەرتاش واقی لێ وڕمانی بوونی هەمان نووسراو بوو لە ناوهۆڵەکەدا، ئەو بە تەواوی تووشی شلەچان بوو و لە ناخەوە دەستی بە رووخان کرد، هەر لەو کاتەی ئەو بیری لەم دێڕە دەرکردەوە پاشا هاتە ناو هۆڵەکە و سەرتاش ویستی پێشوازی لێبکات....بەلاّم کە بینی لەسەر جلی پاشا هەمان دێڕ نووسراوە (بەر لەوەی کارێك بکەیت... بیری لێبکەوە) ئەوا بەیەك جاری لە ناخەوە داڕووخاو ڕەنگی زەرد هەڵگەڕاو شلەژانێکی تواو لەسەری بەدیار کەوت.....!
ئەو هەستی کرد کە مەستیان لە نووسنی ئەم دێڕە تایبەتە بەوا ئەك هەر ئەوەندە بەڵکو هەستێك لە ناخیا دروست بوو کە پاشا پلانەکەیانی ئاشکرا کردوە.
کاتێك خزمەتکارەکە سندوقی تایبەت بە کەرەستەکانی سەرتاشینی پاشای هێنا، ترسێکی یەکجار زۆر سەرتاشی داگرت چونکە لەسەر سندووقەکەش نووسرابوو (بەر لەوەی کارێك بکەیت... بیری لێبکەوە)، لێرەوە سەرتاش کۆنترۆڵی خۆی لەدەستدا، کاتێك ویستی سندووقەکە بکاتەوە دەستەکانی دەلەرزین و بە ئاسانی

وەك جاران بۆی نەكرایەوە، نێو چەوانی نارەقەی لێدەتكا،بە ترووكە چاوێك سەیری پاشای كرد بینی ناسایی رەفتار دەكات و هێمنە، ئەمەش هێندەی تر دڵە راوكێی بۆ سەرتاشەكە دروست كرد.

پاشا هەستی بە شلەژانی سەرتاشەكە كرد بۆیە دەستی كرد بە چاودێری كردنی، سەرتاش ویستی كەفی سابوونەكە لەسەرroومەت و گەردنی پاشا دابنێت بەڵام نەیتوانی ئەم كارە بە باشی بكات، ویستی روو لە دیوار بكات تا خۆی بدزێتەوە لە بینینی راستەوخۆی پاشا بۆیە كە رووی لە دیوارەكە كرد بینی نووسراوە (بەر لەوەی كارێك بكەیت... بیری لێبكەوە) بۆیە هێز و توانای لێبڕا و كەوتە بە زەویدا، و لەبەردەمی پاشا كەوت.

سەرتاشەكە بە گریانەوە دانی بە پلانی كوشتنی پاشاو ووردەكاریەكەی هەموو بۆ گێڕایەوە،پاشان باسی كاریگەری ئەو حیكمەتەی كرد كەچۆن كاری تێكردوە وای لێكردوە لە كارەكەی پاشگەز بێتەوە.

پاشا دوای ئەم رووداوە فرمانی كرد بە دەسگیر كردنی سوپا سالار و ئەوانەی كە بەشدار بوون لەگەڵی لەم پلانەداو، و سەرتاشەكەشی بووری.

پاشا بەرامبەر تابلۆكە وەستاو بەدەستی خۆی تۆزی سەر تابلۆكەی لابرد و بە دڵ خۆشیەوە سەیری دەكرد، بۆیە دڵی بۆ ئەوە چوو خەڵاتی پیرەمێردە داناكە بكات و حیكمەتێكی تری لێبكڕێت!

وەك جارەكەی تر خۆی گۆڕی هاتە ناو بازاڕ و بەرەو دەكانی پیرە دانا بەڕێكەوت.....كە گەیشتە شوێنی مەبەست بینی دوكانە كە داخراوە؟! پرسیاری كرد....گوتیان بەداخەوە ئەو ماوەیەكە كۆچی دوایی كردوە !

چیرۆکەکە لێرە تەواو بوو، بەڵام من هێشتاکە تەواو نەبوومە، بەڵکو بەشێوەیەك و وێنایەکی نویێ لەگەڵتان دەست پێدەکەمەوە......

ئەگەر یەکێکمان ئەم دێرشە بنووسێت (خودا دەتبینێت، خودا ئاگای لێتە، خودا لێت نزیکە،.........) و لەچەند شوێنێکی ماڵەکەتدا هەڵتواسی وەك دیوارەکانی ماڵ، کۆمپیوتەر، لەسەر مێزی نووسینگەکەت، بەرامبەرە خۆت....لە....لە......لە.......

ئەگەر ئەم دێرشە نووسینە لەم هەموو شوێنە نووسراو تۆش بە ووردی کارت لەسەر هۆش و دڵی خۆت کرد تا ئەو رادەیەی لە ناو دەمارەکانی خوێنت سووڕایەوە........

ئایا ژیانت ناگۆڕێت؟

کاریگەری ئەرێنی بەسەرتەوە نابێت؟

رەفتارت راست نابێتەوە؟

لە هەر شوێنێکدا بیت رێك تر و بەرەکەتدار تر نابیت.......؟!

## دوو جار بیر بکەوە بەر لەوەی کارێك بکەیت

دەگێڕنەوە پیاوێکی هەژار ژنی هێناو منداڵێکی لەو ژنە بوو،لەبەر هەژاری بڕیاری دا ژن و منداڵەکەی بەجێبهێڵێت تا بژێوی ژیانیان دابین بکات، بۆیە لەگەڵ هاوسەرەکەی ڕێککەوت کە بۆماوەی بیست ساڵ لەگەشتەکەی بەردەوام بێت، وەئەگەر هاتوو یەك ڕۆژ لەم ماوەیە دوا کەوت ئەوا خێزانەکەی ئازادە و دەتوانێت ماڵەکە بەجێبێلێت و ژیانێکی نوێ پێك بهێنێت.

بەم شێوەیە پیاوەکە ماڵەکە و هاوسەرەکە و منداڵە یەك مانگیەکەی خۆی جێ هێشت و بەرەو هەندەران بەڕێ کەوت.

ئەم پیاوە لە ئاشێك دامەزراو بۆ ماوەی بیست ساڵی تەواو کرێکاری تێدا کرد، تا کاتی ئەوە هات بگەڕێتەوە نێو ماڵ و حاڵی خۆی، بۆیە ڕۆژێکیان بە خاوەن ئاشەکەی گوت: مامە گیان من بڕیارم داوە بگەڕێمەوە وولاتەکەی خۆم و هاوسەر و منداڵەکەم ئێستاکە چاوەڕێی گەڕانەوەمن، چونکە بەڵێنی نێوانمان بیست ساڵ بوو و دەمەوێت بزانم بارەکە لەوێ چۆن دەگوزەرێت.

خاوەن ئاشەکە پێی گوت: ناکرێت ساڵێکی تریش لام بمێنیەوە، تکا دەکەم،من ئێستاکە لەگەڵ تۆ ڕاهاتووم وەك کوڕی خۆم سەیرت دەکەم؟

پیاوەکە گوتی: ناتوانم مامە گیان، کاتی گەڕانەوەم هاتوە، ئاخر ئەوە بیست ساڵە من لە خانەوادەکەم دوورم، ئەگەر ئەمساڵ نەگەڕێمەوە ئەوا هاوسەرەکەم ماڵەکەم چۆڵ دەکات.

خاوەن ناشەکە پێی گوت: تۆ دەزانی من زۆر دەولەمەند نیم....حەزم دەکرد یارمەتیەکی باشت بدەم، باوەڕم پێبکە لەم سێ پارچە زێڕە زیاتر شك نابەم لە ماڵەکەم، ئەوا دەیدەم بەتۆ، تۆ شایەنی زیاتری بەڵام من هەر ئەوەندەم هەیە.
پیاوەکە سوپاسی ناشەوانەکەی کردو سێ پارچە زێڕەکەی لە گیرفانی داناو بەرەو ماڵەوە بەڕێکەوت.
لە کاتی گەڕانەوەی سێ کەس بەلایدا تێپەڕین، دوانیان گەنج و یەکێکیان بە ساڵا چوو کە هیچ قسەی نەدەکرد بەڵکو تەنها سەیری چۆلەکەکانی دەکرد و پێدەکەنی. سلاّویان لەیەکتر کردوو دوای یەکتر ناسین بڕیاریاندا بەیەکەوە گەشتەکە تەاو بکەن.پیاوەکە لە گەنجەکانی پرسی: ئەم پیاوە پیرە کێیە؟ گوتیان باوکمانە.....
پیاوەکە گوتی: ئەی بۆچی بەم شێوەیە پێدەکەنێت؟
گوتیان: ئەو لە زمانی باڵندە دەزانێت بۆیە گوێ لە قسەخۆش و نەستەقەکانیان رادەگرێت و پێدەکەنێت.
پیاوەکە گوتی: ئەی بۆ هیچ قسە ناکات؟
گەنجەکان گوتیان: لەبەر ئەوەی هەر قسەیەك کە لەدەمی دەردەچێت نرخی خۆی هەیە!
پیاوەکە گوتی: نرخی قسەکانی چەندە؟
گەنجەکان گوتیان:نرخی هەر رستەیەك، یەك پارچە زێڕە!
پیاوەکە لە دڵی خۆی گوتی من کەسێکی هەژارم، بە پێدانی پارچە زێڕێك لە بەرامبەر حیکمەتێکی ئەم ریش سپی یە، هەژار تر نابم، بۆیە دەستی خستە ناو گیرفانی و پارچە زێڕێکی دەرهێناو دای بە پیرە پیاوەکە

پیرەپیاوەکە گوتی: لە کاتی لافاو و هەستانی ئاودا لە رووبار مەپەڕەوە و بێدەنگ بوو.

هەر چواریان بەردەوام بوون لە رۆیشتن.

پیاوەکە لەدڵی خۆی گوتی: پیرەمێردیکی سەیرە، زمانی باڵندان دەزانێت و لەبەرامبەر چەند ووشەیەك پارچە زێرێك وەردەگرێت، دەبێت ئەوجارەیان چیم پێ بڵێت ئەگەر پارچە زێرێکی تری بدەمێ؟ جارێکی دەستی نایە ناو گیرفانی و پارچە زێرێکی تری دا بە پیرەمێردەکە!

پیرەمێردەکە گوتی: ئەگەر بینیت باز لەسەر شوێنێکدا دەسووڕایەوە برۆ بۆ ئەم شوێنە و بزانە لەو شوێنە چی روو دەدات و بێدەنگ بوو.

پیاوەکە دووبارە لەدڵی خۆیدا گوتی: بزانە ئەوە چی دەڵێت، چەند جار بینیومە باز لەسەر شوێنی تایبەت دەسووڕێنەوە بەڵام هەرگیز لەم شوێنانە نزیك نەبوومەتەوە تا بزانم چی روویداوە......با پارچەی سێیەمیش بدەم بەم پیرەمێردە تا بزانم ئەم جارەیان چیم پێدەڵێت!

پیرەمێرد گوتی: بەر لەوەی هیچ کارێك بکەی لەدڵی خۆتدا تا ٢٥ بژمێرە و بێدەنگ بوو.

دوای ماوەیەکی زۆر لە رۆیشتن بەیەکەوە، لە شوێنێکدا ناچار بوون لەیەکتر جیا ببنەوە چونکە رێڕەویان جیا بوو، و سوپاسی یەکتریان کرد لەسەر ئەو کاتە خۆشەی بەسەریان برد لەم ماوەیەدا و لەیەکتر جیا بوونەوە.

لەو کاتەی کە پیاوەکە لە دێیەکەی نزیك دەبوویەوە رووبارێکی هاتە پێش، ویستی لە رووبارەکە بپەڕێتەوە بەڵام قسەی پیرەپیاوەکەی هاتەوە بیر، بۆیە لە لێواری رووبارەکە دانیشت و پارچە نانێکی دەرهێناو دەستی بە نان خواردن کرد و چاوەڕوانی ئەوە بوو

لافاوەکە بوەستیٚ ئینجا بپەڕێتەوە، لە ناکاو گوێی لە دەنگێك بوو، سەیری شوێنی دەنگەکەی کرد، دوای کەمێك سوار چاکێك دەر کەوت. سوار چاکەکە سلاّوی کرد و گوتی: بۆ لێرە دانیشتوویت؟ پیاوەکەش گوتی، ئاو هەڵساوە و چاوەڕوانی دامرکانی رووبارەکەم ئینجا دەپەڕمەوە....

سوارچاکەکە پێکەنی و گوتی بڕوانە چۆن لەم ئاوە دەپەڕمەوە.

سوار چاکەکە خۆی بە ئاوەکە دادا، بیٚ نرخانە سەیری ئاوەکەی کرد، کە چوە نێو ئاوەکە نەیتوانی بەرگەی شەپۆلە بەهێزەکانی ئەم رووبارە بگریت بۆیە لەسەر ئەسپەکە کەوتە خوارەوە و خنکا....بەلاّم ئەسپەکە دوای تەقەلاّیەکی زۆر گەڕایەوە لای پیاوەکە ئەویش جلەوی ئەسپەکەی گرت و سواری ئەسپەکە بوو و دەستی کرد بە گەڕان بەدوای پردێك تاکو لێی بپەڕێتەوە.

دوای گەڕانێکی زۆر پردێکی دۆزیەوە و بە ئاسانی پەڕیەوە ئەوبەری پردەکە و بەردەوام بوو لە رۆیشتن بەرە و دێیەکەی. پیاوەکە رێی کەوتە ناو دارستانێکی چڕ، لە راستیدا ترسناك بوو، پیاوەکە گوێی لە دەنگێکی سەیر بوو، سەیری ئاسمانی کرد بینی کۆمەڵە بازێك لە ئاسماندا بەسەر یەك شوێندا دەخولێنەوە و قیژە لێدەدەن....پیاوەکە وەك جاران ویستی دوور کەوێتەوە! بەلاّم قسەی پیرە داناکەی هاتەوە بیر بۆیە بڕیاریدا بچێت بزانیت ئەو بازانە بەدەوری چیدا دەخوولێنەوە.

بەهێمنی و بیٚ ئەوی کەس هەست بە هاتنی بکات لە شوێنی کۆبوونەوەی بازەکان نزیك بوویەوە....بەڕاستی دیمەنێکی ترسناك بوو! سیٚ پیاوی بە کوژراوی بینی، لە نزیك یەکێکیان جانتایەك کەوتبوو. هاتە سەر کوژراوەکان... سەیری جانتاکەی کرد.....پڕ بوو لە پارە و پارچەی زێڕ! بۆی دەرکەوت کە هەرسێکیان لەکاتی دابەشکردندا ریك نەکەوتوون بۆیە یەکتریان کوشتووە!. ئەویش جانتا زێڕەکەی

هەڵگرت و دەمانچەیەکیشی لەگەڵ خۆی برد و خێرا ئەو شوێنەی بەجێهێشت و بەردەوام بوو لە گەشتی گەڕانەوەی.

شەو داهات و پیاوەکە گەیشتەوە دێیەکەی خۆی، ئەو لە خۆشیانا نەیدەزانی چی بکات، ویستی لەدەرگا بدات و بچێتە ژوورەوە و بە بینینیان شادبێت، بەڵام خەتەرەیەك بەدڵی داهات! گوتی با یەکەم جار لەپەنجەرەکەوە سەیری هاوسەرەکەم بکەمو تێربم لە بینینی ئینجا لەدەرگا دەدەم!.

بەڵام ئەوەی چاوەڕوانی نەدەکرد بینی......بینی هاوسەرەکەی لەگەڵ پیاوێکی بێگانە قسە دەکات! پیاوەکە پشتی لەو بوو، لەدڵی خۆیدا گوتی چۆن دەبێت هاوسورەکەم خیانەتم لەگەڵ بکات و پیاوێکی تر بێنێتە ماڵم، ئاخر هیشتاکە کاتمان ماوە.....! بۆیە بڕیاریدا تۆڵەی خۆی بکاتەوە و هەردووکیان بکوژێت...

دەستی لەسەر پەلاپیتکەی دەمانچەکە داناو رووی دەمانچەکەی لە هاوسەرەکەی کرد... لە ناکاو قسەی پیرە داناى بەبیر هاتەوە کە پێی گوت بەر لەوی هەر کارێك بکەی تا بیست و پێنج بژمێرە.....بۆیە نەختێك هێور بوویەوە و بڕیاریدا تا بیست و پێنج بژمێرێت...

لەو کاتەی کە ئەو دەستی کردبوو بە ژماردن، گوێی لە پیاوەکە بوو دەیگوت: دایەگیان بەیانی بەهەمرو جیهاندا دەگەڕێم تا باوکم دەدۆزمەوە، ئەستەمە بتوانم بێ ئەو بژیم....

پاشان پرسی: ئەرێ دایکە ئێستاکە چەند ساڵە باوکم رۆیشتوە؟ دایکەکەش وەڵامی دایەوە: بیست ساڵی تەواوە کوڕەکەم ئەوکاتەی باوکت رۆیشت تۆ تەمەنت تەنها مانگێك بوو.

که پیاوەکە ئەم قسانەی بیست، پەشیمان بوویەوە لەوی کە کردی... ئەو هێندەی نەمابوو بەدەستی خۆی ماڵی خۆی وێران بکات، و لەدڵی خۆیدا گوتی: ئەگەر تا بیست و پێنجم نەژماردبا ئەوە تا ماوم بەم خەفەتە دەمامەوە، بۆیە هەر لە پەنجەرەکەوە هاواری کرد: ئەی هاوسەرە شیرینەکەم، ئەی کوڕە نازدارەکەم ئەوەی چاوەڕوانی بوون ئەوا هاتۆتەوە و وەرن پێشوازی لێبکەن......

بەر لەوەی کارێك ئەنجام بدەین، پێویستە لە سەرەتا بیری لێبکەینەوە....تا لە پاشان پەشیمان نەبینەوە......

# بەهای خۆشەویستی راستەقینە

ژیان لە ناو خۆشەویستی و وەرگرتنی خشی لێی یەکێکە لەو ئاواتانەی کە مرۆڤ هەیەتی، کاتێك تۆ کەسێکت خۆشتر دەوێت لەهەموو کەسەکان و شتەکان لەهەموو دونیادا و ئەو هەستەت لا دروست بوو کە ئەو کەسە بە بەها ترین و باشترین و ئازیز ترین کەسە جیهاندا،ئیتر ئاگاداری دەبیت و بەشداری دەکەیت لە چارەسەرکردنی گرفتەکانی و هاوخەمی دەبیت و کەم و کورپیەکانی بۆ پڕ دەکەیەوە و نایەڵیت پێویستی بەکەس بێت.

لەم کاتەدا تۆ تامی خۆشەویستی دەکەیت و چێژی لێوەردەگریت چونکە هەست دەکەیت قوربانیت داوە، ئەمەش مانای خۆشەویستی راستەقینە دەگەیەنێت، بۆیە دڵت پڕ دەبێت لە ژیان و، هەنگاوەکانت رووناك دەبن و هەستەکانت راستەقینە دەبن و تیشکی شادی و دەدەنەوە.

لە کۆنەوە دوورگەیەك هەبوو، هەموو هەستەکانی مرۆڤی تێدا کۆببوویەوە، خۆشی و شادی و رق و ئیرەیی و...ژیانیان لەسەر ئەم دوورگەیەوە بەسەر دەبرد.

رۆژێکیان هەستەکان هەواڵی ئەوەیان زانی کە دوورگەکەیان دووچاری نقوم بوون دەبێتەوە، بۆیە بڕیاریان دا زووتر ئەم شوێنە جێبێڵن، کەچی خۆشەویستی حەزی بەوە دەکرد تا دواساتەکانی ژیانی ئەم دوورگەیە هەر لەوێ بمێنێتەوە.

هەرکە دوورگەکە دەستی کرد بە نقوم بوون، خۆشەویستی داوای یارمەتیکرد لە دەوڵەمەندی رزگاری بکات، ئەو کەشتیەکی زۆر گەورەی هەبوو، بۆیە پێی گوت: دەتوانیت لەگەڵ خۆت ببەی؟ دەوڵەمەندی وەڵامی دایەوە: بە دڵنیاییەوە نەخێر؟! چونکە کەشتیەکەم پڕە لە زێڕو شتە گران بەهاکانم، شوێن بۆ تۆ نەماوە!.

ئەمجارەیان بڕیاری دا داوای یارمەتی لە (لەخۆبایی) بکات ئەویش بە خۆشەویستی گوت: ناتوانم یارمەتیت بدەم تۆ هەموو گیانت تەڕ بوە ئەگەر بێیتە ناو کەشتیەکەم بۆی هەیە تێك بچێت.

خەمباری بە لای خۆشەویستی تێپەڕی، ئەمجارەیان داوای یارمەتی لەو کرد کەچی خەمباری وەلاّمی دایەوە وگوتی: ئەی خۆشەویستی من ناتوانم یارمەتیت بدەم چونکە من حەز دەکەم بە تەنیا بم.

ئەمجارە شادی تێپەڕی و ئەویش نەیتوانی یارمەتی خۆشەویستی بدات و ڕۆیشت.

لە ناکاو یەکێك بانگی کرد و گوتی ئەی خۆشەویستی وەرە لەگەڵ من با بڕۆین من یارمەتیت دەدەم....

دەنگەکە بە هی کەسێکی پیر دەچوو، خۆشەویستی هەستی بە خۆشیەکی زۆر کرد چونکە یەکێکی دۆزیەوە بتوانێت یارمەتی بدات و تەنانەت لە بیری چوو لە ناویشی بپرسێت....کاتێك لەسەر زەوی دابەزین کەسە پیرەکە خۆشەویستی جێهێشت و ڕۆیشت،کاتێك خۆشەویستی هاتەوە بیری کە پێویستە سوپاسی مامە پیرە بکات، لە زانستی باشتر نەدۆزیەوە پرسیاری ناوی ئەو کەسەی لێبکات بە تایبەت کە ئەویش تەمەندارە و خەڵکانێکی زۆر دەناسێت، ئەویش وەلاّمی دایەوە و گوتی: ئەو کەسەی رزگاری کردیت (کات) بوو! خۆشەویستیش بە سەرسوڕمانەوە گوتی کات؟!

لێرەدا زانست بە پێکەنینێکی پڕ لە حیکمەتەوە گوتی: بەڵێ (کات).....تەنها کاتە دەتوانێت بەهای خۆشەویستی بزانێت.

بە های راستەقینەی خۆشەویستیە وات لێدەکات بە فیداکاریەوە بژیت و هەست نەکەیت تۆ شەهیدی،چونکە تۆ لە دڵتا شتێکت لە باوەشدا گرتوە، دەستی هیچ کەسێکی پێناگات.

## کورتەیەک دەربارەی دانەر موحسین جەبار:

لە دایك بووی: ١٩٧٢

- ➢ یەکەم پەیمانگەی لە بواری پەیوەندی گشتی و پەرەپێدانی خۆیەتی لە عێراق دا دامەزراندوە لە ساڵی ٢٠٠٠ز......
- ➢ ڕاهێنانی بە سەدان کەس و دەیان کۆمپانیا کردوە لە بواری پەرەپێدانی تواناکان و بە بازارکردنی کاڵاکان.
- ➢ بەڕێوەبەری گرووپی کۆمپانیاکانی (صنّاع الابداع) ە (بۆ ریکلام کردن و وەبەرهێنان و ڕاهێنان).
- ➢ بەڕێوەبەری ئەم ماڵپەڕانەی خوارەوەیە:

1- ڕێبەری عێڕاقی نێو دەوڵەتی (www.ibd-iq.com).

2- ڕێبەری کەمکردنەوەی عێڕاقی (www.iraqtd.com) دليل المناقصات العراقية.

3- بازاری عێڕاق بۆ خانوو بەرە (سوق العراق العقاري) (www.estateiraq.com).

بۆ ئەوەی پەیامەکە بەردەوام بێت، ئەم کتێبە بە دیاری بدە بە خۆشەویستانت چونکە ڕێنیشاندەری چاکە وەك چاکە کارەکە وایە

**چی لەم کتێبەدا دەخوێنیەوە:**

دەیان چیرۆکی راستەقینە، کە ژیانی خاوەنەکانیانی گۆڕیوە و هاتوونەتە ریز سەرکەوتوان و داهێنەران، نەك هەر ئەوەندە بەڵکو هەندێکیان بوونە خاوەن ملیۆنان دینار و دۆلار، بوونە سەرکردە و هەڵکەوتوان.

چەندین لەم کەسایەتیانە ژیانیان لە تاریکیەوە گۆڕا بۆ رووناکی.

ئەم کتێبە هەلێکی راستەقینەیە بۆ ئەو کەسانەی کە بیانەوێت پەرە بەخۆیان بدەن و گۆڕانکاری بەسەر خۆیان دابێنن.

کتێبێکە زیاتر لە جارێك دەیخوێنیەوە و هاوڕێکانیشت دەیخوێننەوە

## ناوەرۆك

## کورتەیەك دەربارەی دانەر موحسین جەببار :

لە دایك بووی : 1972

- یەکەم پەیمانگەی لە بواری پەیوەندی گشتی و پەرەپێدانی خۆیەتی لە عێراق دا دامەزراندوە لە ساڵی 2000ز .
- راهێنانی بە سەدان کەس و دەیان کۆمپانیا کردوە لە بواری پەرەپێدانی تواناکان و بە بازارکردنی کاڵاکان .
- بەڕێوەبەری گرووپی کۆمپانیاکانی « صناع الابداع » « بۆ ریکلام کردن و وەبەرهێنان و راهێنان » .
- بەڕێوەبەری ئەم ماڵپەڕانەی خوارەوەیە :

1- رێبەری عێراقی نێو دەوڵەتی

2- رێبەری کەمکردنەوەی عێراقی

3- بازاری عێراق بۆ خانوو بەرە

دەیان چیرۆکی راستەقینە ، کە ژیانی خاوەنەکانیانی گۆڕیوە و هاتوونەتە ریز سەرکەوتوان و داهێنەران .
نەك هەر ئەوەندە بەڵکو هەندێکیان بوونە خاوەن ملیۆنان دینار و دۆلار ، بوونە سەرکردە و هەڵکەوتوان .
چەندین لەم کەسایەتیانە ژیانیان لە تاریکیەوە گۆڕا بۆ رووناکی .
ئەم کتێبە هەڵێکی راستەقینەیە بۆ ئەو کەسانەی کە بیانەوێت پەرە بەخۆیان بدەن و
گۆڕانکاری بەسەر خۆیان دابێنن .
کتێبێکە زیاتر لە جارێك دەیخوێنیەوە و هاوڕێکانیشت دەیخوێننەوە